خاوەنی ئیمتیاز






دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



گرافیك دیزاینر ئارام عەلی

سەرنووسەر هیوا قادر

سالّی یەکەم

ژمارە

4

# سەرنووسەر

مەرگی شێرکۆ بێکەس
تەنهای کردم، تەنهاییەك
لەو جۆرەی کە لەنێوان بینین
و نەبینیندا بەجێت ئەهێڵێت و
پڕت ئەکات لە غەمباری و بێ دەنگی؛
یادەوەری ئەم پیاوە بۆ من یادەوەرییەکی
شیعرییە، ئەم یادەوەرییەش لەو ڕۆژانەوە
دەستیان پێکرد کە من منداڵێکی غەمباری پڕ لە
پرسیاری عەجول بووم و بەدیار شیعرەکانییەوە بووبووم بە چاوێکی
گەورە. من بە جۆرێك لەناو ماڵە ئاڵتونی و شیعرییەکەی ئەودا خۆم شاردبووەوە
هەرچیم ئەوت هی ئەو بوو، سەرەتا ئەم وتنە سادانە دڵخۆشیان ئەکردم تاکو
گەیشتم بەو ڕۆژەی کە ئیتر ئەبوو لە دنیای ئەو بێمە دەرەوە و بکەومە گەڕان. دوای
ئەو قۆناغە من بەجۆرێکی تر ئەوم خۆشویست، خۆشویستنێك کە کەوتبووە دوڕیانی دوودڵی
ویستن و نەویستنی شیعری ئەوەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی شیعری شێرکۆ لەیەکەم عەشق ئەچوو
نەم ئەتوانی تەواو لەبیری بکەم، بۆیە ئەو هەمیشە یادەوەرییەك بوو بەڵام زیندوو، یادەوەرییەکی
شیعریی، سەرباری بیرخستنەوەی ئەو ڕۆژە ڕەش و پڕ لە تراژیدیانەی کە تەنانەت خوداش کوردی
فەرامۆش کردبوو، بەڵام شێرکۆ نا، ئەو بەردەوام شیعری بۆ کوردبوون ئەنووسی، کوردێك کە
بەتەنها ئەکوژرا و کەس گوێی لە ئاهەکانی کوشتنی نەبوو.
جگە لە جیاوازیی وەچەکان و پرسیارە شیعریی و جاویدانییەکان، جگە لە زمان و تەکنیك و کارکردن
لەناو جوانیدا، سەرباری کوردبوون و ئەو مانایانەی کە شیعری ئەو بەردەوام بەرهەمی ئەهێنان؛
هەموو ئەمانە پێکەوە لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن و ئەزموونددا منی لە شێرکۆ بێکەس دوورخستەوە،
چونکە بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ شیعری شێرکۆ بێکەس بەرهەمهێنی پەیامێك بوو کە من لە
گەورەبوونمدا تەواو دژ بە بوونی هەموو پەیامێك بووم بدرێتە پاڵ شیعر، بەڵام سەرباری هەموو
ئەمانەش ئەو هەمیشە لە یادەوەریی شیعریمدا ئەو عەشقە بوو کە نەمئەتوانی فەرامۆشی بکەم.
من کە یەکێك بووم لە وەچەکانی ناو جەنگە یەك بەدوای یەکەکان و منداڵی و گەنجیم لە دەست
فڕێندرابوو، ترسێکی بێ ئەندازە چووبووە ناو ڕۆح و هۆشیاریمەوە و دژ بە هەموو پەیامێك بووم
بدرێتە پاڵ نووسین، چونکە ئەکرا لەناو ڕێکەوتە ڕەشەکاندا ڕووناکی ژیانی ئینسانێك بکوژێنێتەوە.
مەرگی شێرکۆ مەرگێکی گەورەبوو، مەرگی ئەو هەمووومانی خستە سەر بیرکردنەوە لە مەرگی
خۆمان؛ ئێمە کەسمان وەك ئەو بە گەورەیی نامرین، وەك ئەو نابینە دواهەمین شاعیری قۆناغێك لە
ماناکانی کوردبوون، ئەو بەرهەمهێنی مانا شکۆدارەکانی کوردبوون بوو لە شیعری خۆیدا و دواتریش

# مەرگی شێرکۆ بێکەس تەنهای کردم

لە ژیانی پراكتیك
و سیاسیدا
زەلیلبوونی ئەو
مانایانە ژیا و مەرگیانی
بەچاوی خۆی بینینی،
وەك بینینی باوكێك بۆ
مەرگی منداڵێكی كە خۆی
هێناویەتە ژیانەوە و خۆشی
شاهیدی مەرگی بێت؛ "ئێستا كچێك
نیشتیمانمە" نموونەی پیشاندانی بەرزی
ئەو جۆرە مردنە بوو كە شێركۆ ئازایانە
ئەو مانایانەی بەدەستی خۆی ناشت و دواتر
شاعیرانە كەوتەوە گەڕان. دوای ئەم پیاوە كەس
ناتوانێت بەو مانا شیعریانە جارێكی تر بنووسێت،
ئەوەشی وابنووسێت جگە لە نەزانین هیچی تر
بەرهەمناهێنێت. سەرباری ئەو ڕێكەوتەی كە لەگەڵ
مەرگی شێركۆ بێكەسدا كۆمەڵگەی كوردیش چووە
ناو قۆناغێكی سیاسی و كۆمەڵایەتی وەهاوە كە من بە
قۆناغی "مەرگی پەخشانی سیاسی" ناوی ئەبەم، پەخشانێك چیتر
توانای بینینی جوانیی نییە، چیتر باس لە ڕۆحی زیندووی ئینسانی سەردەم ناكات،
لەدەرەوەی زەمەنێكی بەسەرچووەوە وەستاوە و بەدەست سیاسەتێكەوە زەلیلە كە هەموو شتێكی
تیادایە ئینسان نەبێت، لە كاتێكدا زەمەنەكانی ڕابردوو بۆ شێركۆ بێكەس ناچاریی و بەسەردا
سەپێنراوبوو بۆئەوەی لەناو كوردبووندا ڕوویەكی دیاری ژیان دۆستی و جوانی ببینێت و بدۆزێتەوە،
بەڵام لەم زەمەنەی ئێستادا چیتر ئەو مانایانە بەهایی بینین و جوانییان نەماوە.
هەموو مردووەكان جوان نین، بەڵام هەموو شاعیرەكان جوانن كە ئەمرن چونكە زۆر بریندارانە
بەجێمان ئەهێڵن، وەك دەنگی باڵدارێكی بریندار هەمیشە تێكستەكانیان لەناوماندا لە خۆشاردنەوە
و دەركەوتندان، دیارە هەر ئەمەشە وائەكات جوانی ببێتە بەهەشتێكی بێ پاداشتی شاعیران،
بەهەشتی تەنهایی شاعیران تەنها لە ناو مەملەكەتی داهێنانی شیعری خۆیاندایە، شێركۆ بێكەسیش
لەناو بەهەشتی داهێنانەكەی خۆیدا تا زەمەنێكی دوورودرێژ بە زیندوێتی ئەمێنێتەوە.

# شێرکۆ و سێ وێستگەی کورت

**بەختیار عەلی**

## شاعیر و مردن

مردن، شاعیران بەرەو پاکی دەگەڕێنێتەوە... پاکی بە مانا دینییەکەی نا، بەڵکو بەو مانایەی هەموو واتایەکی هەڵە و تێپەڕ لە جەستەی شیعر دەتەکێنێت. مردن ئەو ساتەیە، شیعرییەت، لە هەر ساتێك زیاتر، لەدەرەوەی هیچ ناونانێکی تێپەڕ بەرجەستە دەبێت. شاعیر لەگەڵ مردنیدا لە هەموو ناوکۆییەکان دەچێتە دەرەوە، تاکە سیاقێك لە ناویدا دەمێنێتەوە، پەیوەندی نێوان شیعر و ئەبەدییەتە. بە مردن شاعیر دەگەڕێتەوە بۆ دەرەوەی زەمان وەك کوڕی شوێن و کاتێك تێدەپەڕێ و دەبێت بە کوڕی هەموو

شوێن و کاتەکان. بوون لە زەمەندا شوناسێکی نەخوازراو دەدات بە شاعیر. شیعر ئەکتێکە دژ بە شوناس، دژ بەوەی کە ناوێکی ئەبەدی لە شتەکان بنرێت، گێڕانەوەی زمانە بۆ پێش ناونان، بۆ پێش ئەوەی لە نێوان ئاماژ و بۆئاماژدا پەیوەندییەکی بەستوو دروستبێت. شیعر دەسەڵاتی وشەیە بەسەر مانادا، دەسەڵاتی ئاماژە بەسەر بۆئاماژدا. شاعیر تا خۆی لە ژیاندایە، شیعری بەجۆرێکی بێمانا و ناهەق بەخۆیەوە دەبەسترێت، مانای شیعری بە مانای ژیانییەوە گرێدەدرێت. ژیانی شاعیر بەجۆرێك لە جۆرەکان مەترسییە بۆ سەر شیعرەکانی، ناچارماندەکات کارەکان لە پەیوەندیدا بە خۆیەوە، بە مەرجەعێکەوە بخوێنینەوە... ساتی مردنی شاعیر، ساتی ئازادبوونی شیعرە، ساتی ڕزگاربوونی قەسیدەیە لە راڤە مێژوویی و سیاسییەکەی. ئەو سەربەخۆییەی کە شاعیران بۆ شیعر بەدوایدا دەگەڕێن، تەنیا بە مردنی خۆیان دەتوانن بیهێننە دی. مردنی شاعیر، تەکاندنی هەموو تۆزێکی تێپەڕە لەسەر قەسیدەکان.

## شاعیر و بێدەنگی

ئەو بۆشاییە چییە مەرگی شاعیر دروستیکردوە. مەرگی شاعیر ئاماژەیە بۆ چاڵێك، بۆ درزێکی نوێ لە جیهاندا، درزێك پێش بوونی شاعیر پێشبینیکردنی ئەستەم بوو، دونیای دوای لەدایکبوونی شاعیر وەك دونیای پێش لەدایکبوونی نییە. بێدەنگی شاعیران ترسناکە، مردنی شاعیر، تەنیا وەستانی دڵێك نییە لە لێدان، بەڵکو وەستانی زمانە لە لێدان، دروستبوونی دیوارێکە لە نێوان زمانی قسە کردن و ئاسۆ دوورەکاندا، تاوەکو شاعیر زیندووە، زمان دەتوانێت دیوە نهێنییەکانی

خۆی ببینێت. مردنی شاعیر، مردنی ڕێگایەکە بۆ ناو زمان، سەرەتای بێدەنگییەکە کە زمان لە قاڵبە دێرینەکانیدا دیلدەکات. بێدەنگی دوای مردنی شاعیر، هەڕەشەی گەڕانەوەی زمانە بۆ ناو ڕووبەرە تاریکەکانی، بۆ ناو ئەو بێدەنگییە نهێنی وهەمیشەییەی لە قووڵایی زماندا خەوتووە. تاریکی ناو زمان، هیچ کات وەك ساتی دوای مردنی شاعیر بەرجەستەنابێت. مردنی شاعیر پێماندەڵێت، کە زمان لە کوێدا دەشێت دوایی بێت. ئەو بێدەنگییەی شاعیر جێیدەهێڵێت، بێدەنگی مردوویەك نییە کە چیتر قسەناکات، بەڵکو بێدەنگی زمانە کە بەر تاریکی خۆی دەکەوێت. مەرگی شاعیر وادەکات پتر هاواربکەین، پتر بیر لە چالاککردنەوەی زمان بکەین، پتر پەلامارەکانمان بۆ دڵی ئەو تاریکییە چڕبکەینەوە. مردنی شاعیر، گەورەترین بەهانەی نووسینە... نووسین دوای مردنی شاعیران، مانایەکی تری هەیە. مردنی شاعیر، بەرەو ترسمان دەبات لە بێدەنگی، لەو بۆشاییەی کە پڕ ناکرێتەوە. خودی ئەو ترسە دینەمۆی هەموو قسەیەکی دواترە، دروستکەری هەموو ڕستەیەکی دواترە. بێدەنگی شاعیر تەنیا بیدەنگی نییە، بەڵکو تینوێتییەکی نوێیە بۆ قسەکردن.

## شاعیر وەك ڕوداو

شێرکۆ سەمبولی بەدەستهێنانی سەربەخۆییەکی ستاتێکییە لە واقیع. ئەوەی سیاسییەکان ناتوانن بەدەستییبهێنن، شاعیران زووتر پێیدەگەن: سەربەخۆیی. بەڵام هەموو کایەیەکی سەربەخۆ، وەك

دۆلۆز دەڵێت، ئاماژەیە بۆ دروستبوونی سەر زەمینێکی نوێ و دەرکەوتنی کیشوەرێکی نوێ، لە ڕوانینی ئینسانیدا. سەربەخۆیی شاعیران هەمیشە قووڵتر و ڕادیکاڵیترە لەسەربەخۆیی سیاسی، چونکە ئیشکردنە لەسەر لەدایکبوونی خاکی نوێ، هەرێمی نوێ... جێگاگەلێك کە پێش شاعیر نین و بوونیان بە هاتنی شاعیرەوە هەیە، جێگاگەلێك کە دوای مردنی شاعیر نامرن، بەڵکو هەمیشە لێرەن، وەك مانەوەی فیردەوسە ونەکەی میلتۆن، وەك مانەوەی وێرانە خاکەکەی ئالیوت لەگەڵمان. مردنی شاعیر، هەمیشە ڕوداوێکی گەورەیە، ڕوداوە بەو مانایەی شاعیر دەگۆڕێت بۆ ساتێکی ناچاریی، بۆ وێستگەیەك کە بۆ تێگەیشتنی مێژوو پێویستمانە. سەرەتا سەرهەڵدانی شاعیر تەنیا ڕێکەوتە، بەڵام لە ساتی مردنیدا، لەو کاتەدا کە ئاوڕ لە دواوە دەدەینەوە، تێدەگەین کە هاتنی شاعیر، پێداویستییەکی گەورەی بوونمان بووە. شیعر ڕوداوە بەو مانایەی کە جیهان بە بێ شیعر هەمیشە کەمتر لە خۆی دەنوێنێت، زمان و خەیاڵ کەمتر دەنوێنن... ڕوداوە بەو مانایەی کە ئەگەر نەبێت، هەست بەو جیاوازییە ناکەین کە دەکەوێتە نێوان سەردەمەکانەوە، هەست بەو خاڵە ناکەین کە دەکەوێتە نێوان فاسیلەکانی زەمانەوە. شێرکۆ بۆ ئێمە هەمیشە وەك خاڵێك، وەك فاسیلەیەکی جیاکەرەوە لە نێوان سەردەمەکاندا دەژی. جیهانی پێش شێرکۆ وەك جیهانی دوای شێرکۆ نییە... ئەوە ئەو ئاسەوارە قووڵەیە کە شیعر لەسەر زەمەن جێیدەهێڵێت. ئاسەوارێك کە ئەفسون و سیحرێکی هەیە وادەکات هەمیشە بەدوای ماناکەیدا بگەڕێین.



# کارۆس لە دواهەمین تابلۆی مانیدا

مەحمود نەجمەدین

پێنج مانگ دوای مردنی کارۆس، بەرەبەیانێکی غەمگینی پاییز، لە بیمارستانێکی شرٍ و پیسدا، مانی لە دایکبوو. ژیانی ئەو لە ماڵێکی خامۆشەوە دەستی پێکرد، لە نێو کۆمەڵێك یادەوری و وێنەی کارۆسدا ژیانی بەسەربرد. مانی هێندە لەو وێنانەی روانیبوو دەیتوانی هەر بە وێنە ژیانی باوکی بگێڕێتەوە، ئەو باوکەی پێش لە دایکبوونی وی مرد، مانی نووسینی پشتی هەموو وێنەکانی ئەزبەر کردبوو، هەموو وێنەکانی کارۆسی لە چاوەکانیدا هەڵگرتبوو، لە منداڵییەوە هەر بە خۆرسك قسەکردن و شێوازی جوڵانەوە و مامەڵە و کردارەکانی دەقاودەق وەك باوکی بوو. زۆرێك لەوانەی کارۆسیان دەناسی بەبێ هیچ گومانێك دەیانگوت "رۆحی کارۆس چووەتە جەستەی مانییەوە"، مانی هەر لە منداڵییەوە وەك پەرجوویەك هات. مەلاکان بەترسەوە دەیانگوت "سیحر و جادوو لە رۆحی ئەو منداڵە دایە" پیاوانی رۆحانیش بەشادییەوە دەیانگوت "مانی شەوقێکە کونجە تاریکەکانی دەرون

ڕۆشن دەکاتەوە".
منداڵیی مانی وەك هەموو منداڵانی ئەو شارە بە دۆخێکی ناخۆشدا تێپەڕی. ژیان لە شارێکدا، کە هەموو حیکایەتەکانی بۆنی خوێنی لێدێ. مانی بە کێشانەوەی وێنەکانی باوکی، بوو بەنیگارکێش. وێنەیەکی کارۆس نەبوو، کە مانی پتر لە سەد جار لێی رانەمابێ. شەوانە تا درەنگان لە وێنەکانی باوکی رادەما، تا وای لێهات چاوەکانی پڕبوو لە وێنەی کارۆس، وێنەی منداڵی و مێرمنداڵی و وێنەی گەنجی و سەردەمی زانکۆ و سەردەمی فەرمانبەریی و وێنەکانی گەشت و سەیران، وێنەی کارۆس کاتێك خەوتووە، کاتێك پێدەکەنێ، کاتێك غەمگینە... خەیاڵدانی مانی پڕبوو لە وێنەی کارۆس، هەر ئەو وێنانە مانیان کرد بەو نیگارکێشەی کە خەڵکی شار نازناوی هونەرمەندە عارفەکەیان پێبەخشی. مانی دەیویست لە ڕێگای تابلۆکانەوە کارۆس زیندوو بکاتەوە، ماڵەکەی پڕ کردبوو لە تابلۆی باوکی، هەموو ئەو تابلۆیانە هێڵکاریی و ێنە کا نی رابردووی کارۆس بوو.
لە یەکێ لە



تابلۆکانیدا کارۆس لەبەردەم باخچەیەکی گەورەی شاردا ڕاوەستابوو، ئەو باخچەیە ئێستا گۆڕاوە، سیمای پەرژین و گوڵ و درەختەکانی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە تابلۆکەدا کارۆس تا ئەژنۆی دەرکەوتووە پانتۆڵ و کراسێکی سپی پۆشیوە، لە روخساریدا زەردەخەنە دەبینرا. پێدەچوو ئەو رۆژە لە رۆژە خۆشەکانی ژیانی بێت. لە چاوەکانیدا دەریایەك لە شادمانی دەبینرا.
لە تابلۆیەکی دیکەدا کارۆس لەسەر لوتکەی شاخێکی بڵند دانیشتوە، پانتۆڵێکی خاکی و کراسێکی قاوەیی پۆشیوە، لەم تابلۆیەشدا دیسانەوە زەردەخەنە روخساری کارۆسی داپۆشیوە، بە هەردووك چاوی سەیری ناو کامێراکەی دەکرد. لە پشتییەوە ئاسمانێکی شین و پەڵە پەڵەی هەوری سپی و گەش دەبینرا، پۆلێك باڵندە بێ جووڵە لە قووڵایی ئاسماندا راوەستابوون، پەڵە هەورەکان وەستابوون، تابلۆیەکی بێ گیان و بێ جوڵە بوو. لە تابلۆکەدا ماندوو بوون بە جەستەیەوە دەبینرا، پێدەچوو تازە گەیشتبێتە سەر لووتکەی شاخەکە.
یەکێکی دیکە لە تابلۆکانی مانی، وێنەی کۆمەڵێك خوێندکاری زانکۆ بوون لە گەشتێکی بەهارەدا روویان لە سەیرانگایەك کردبوو، لە تابلۆکەدا کارۆس کابۆیەکی شینی تۆخ و تیشێرتێکی خەت سور و سپی پۆشیبوو، لە ناوەڕاستی هاوڕێکانیدا دانیشتبوو، لە پشتییەوە روخساری غەمگینی کچێك دەبینرا. ئەم تابلۆیەش چرکەساتێکی بێجووڵەی رابردوو بوو.
لە تابلۆیەکی دیکەدا، کارۆس لە بەرگێکی سەرتاپا رەشدا، بەروخسارێکی غەمگین و جەستەیەکی تێکشکاوەوە لەبەردەم ئوتێلێکی گەڕ و شڕدا راوەستابوو، ئەو ئوتێلە ئێستا گۆڕاوە، بووە بە میوانخانەی وەفدە

گەورەکانی دنیا، دیوارەکانی بە بەردی مەڕمەڕ داپۆشراوە، شووشەی پەنجەرەکانی ئاوێنەن، هەزاران گڵۆپ دیوار و شووشە و باخچەی ئوتێلەکەی ڕۆشن کردووەتەوە.
لە تابلۆیەکی دیکەدا، کارۆس لەناو باخچەکەی ماڵی باوکی لە سەر ئەسکەمیلێك دانیشتووە، بیجامەیەکی خەت خەتی لەبەردایە، بە کلینێکسێکی پەمەیی چاویلکەکەی پاك دەکردەوە. ئەو باخچەیەش وەك خۆی نەماوە، بەهۆی جەنگەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە دوای ڕاپەڕینەوە بنەماڵەی کارۆس ئەو ماڵەیان بەجێهێشت و بەرەو کوێستان ڕەویان کرد. ئیتر درەختەکانی باخچەکەش وشکبوون، خانووەکەش بوو بە کەلاوە.
لە تابلۆیەکی دیکەی مانیدا، کارۆس لەناو دوکانی کتێبفرۆشییەکەیدا ڕاوەستاوە و پەڕۆیەکی بەدەستەوەیە خەریکی پاککردنەوەی کتێبە فەرامۆش کراوەکانە، ئەو کتێبانەی خەریکە بە حەسرەتی خوێنەرێکەوە دەڕزێن. لە وێنەکەدا کارۆس زۆر غەمگین دەبینرا. غەمگینی شارێك کە ڕۆژگارێك عاشقی کتێب بوون و هەنووکە وەك مەغۆل دوژمنی کتێبن. ئەم تابلۆیەش نەیتوانی گوزارشت لە زیندوویی کارۆس بکات. ئەو کێبخانەیەش ئێستا ئاسەواری نەماوە و بووە بە دوکانی مۆبایل و لە جێگای کارۆسیش کوڕێکی گەنج دانیشتووە. لەسەر جامخانەی دوکانەکەش نووسراوە "مۆبایل فرۆشی ئیمۆ".
مانی تەواوی وێنەکانی کارۆسی کێشا و هیچکام لەو تابلۆیانە ئارامییان پێنەبەخشی. ئەو دەیویست لە وێنەکاندا زیندووی بکاتەوە، دەیویست وێنەیەك بکێشێ پڕاوپڕ بێ، بەڵام هیچکام لەو تابلۆیانە بە پلەی کەماڵ نەگەیشتن. تا شەوێکی گەرمی هاوین، درەنگانێك مانی خۆی گۆڕی و چووە دەرەوە و بە کۆڵان و شەقامەکانی شاردا گەڕا. بەنێو دڵی تاریکیدا بۆ ڕۆحی کارۆس گەڕا. لە تاریکی شەودا، لەناو تارماییەکانەوە دەرکی بە ڕۆحی کارۆس کرد. گوێی لە دەنگێك بوو بانگی دەکرد "مانی، کوڕە ئازیزەکەم، ئەوەتام لێرە.."
مانی بەدوای دەنگی کارۆسدا بەناو تاریکی بازاڕ و کۆڵانەکاندا گەڕا، نەرم نەرم بە دوای ئەو دەنگەدا دڵی تاریکی کێڵا، دەنگی کارۆس بەرەو قەڵا پەلکێشی کرد، بەنێو کەلاوەکانی قەڵادا بە دوای دەنگەکەدا گەڕا، تا گەران ماندووی کرد و بڕستی لێبڕی و لە سەر دیواری یەکێ لە کەلاوەکانی قەڵا دانیشت و بەچاوی دڵی بۆ ڕۆحی کارۆس گەڕا، تا ئەوکاتەی شەوقی ئاگری کێڵگە نەوتییەکانی شار سەرنجی ڕاکێشا، شەوقی ئەو ئاگرەی ساڵانێکی زۆرە



شەوی تاریکی ئەو شارەی ڕۆشن دەکردوە، ئاگرێك زیاتر لەنیو سەدەیە دڵی خەڵکی ئەو شارە دەسووتێنێ. مانی بە خەیاڵی کارۆسەوە چاوەکانی بڕیبووە ئاگرەکە و لەژێر لێوەوە دەیگوت "باوکە تۆ لەکوێی..؟" هەر ئەوکاتە کارۆس بە هانایەوە هات "ئەوەتام، مانی ئەوەتام لەناو ڕۆحی خۆتدا، بگەڕێ دەدمدۆزیتەوە". مانی بە بیستنی ئەو دەنگە شێتگیر بوو، چاوەکانی بە تەواوی کردەوە و سەیری ئاگرەکەی کرد و گوێی بۆ بیستنی دەنگی کارۆس ئامادە کرد. شەوقی ئاگرەکە سەرنجی ڕاکێشا و لە قەڵاوە بۆ لای ئاگرەکە وەڕێ کەوت. تا لە ئاگرەکە نزیکتر دەبووەوە زیاتر بەرەو دەریای بێهۆشی و مەستبوون دەچوو، نەرمە نەرمە لە شەوق و دەنگی کارۆسدا مەستبوو، بەرەبەیان کاتێ هۆشی هاتەوە. لە دەشتێکی چۆڵ و چەور و نەوتاوی دابوو، کەسی لێوە دیار نەبوو، جەستەی وەك ئاگرەکە گەرم بوو. جلەکانی خۆڵاوی بوون.

بە جەستەیەکی هیلاك و ڕۆحێکی ئارامەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە و کاتێکیش چووە ماڵەوە خانەوادەکەی لە ڕوخساری مانیدا شتێکیان دەبینی، خۆشیان نەیاندەزانی چییە، وەك ئەوەی پەیامێکی خۆش لە تەوێڵیدا بخوێننەوە، بەڵام مانی دەیزانی چییە، ڕۆحی کارۆس هاتبووە جەستەیەوە، کارۆسی لە دەروونی خۆیدا دۆزییەوە. لە دوای ئەو حاڵەتەوە هەر کاتێ مانی غەمگین بوایە کارۆس دەیگوت "ئەوەتام، مانی ئەوەتام، لەگەڵتام، یەك بست لێت دوور نەکەوتوومەتەوە." هەفتەیەك



دوای ئەو گەشتە بەرەبەیانییەك مانی لە خەو هەڵسا و دەستی بە دروستکردنی وێنەی کارۆس کرد. ئەم وێنەیە وەك وێنەکانی دیکە نەبوو. بۆ یەکەم جار مانی وێنەی کارۆسی کێشا، بەبێ ئەوەی سەیری وێنەکانی ڕابردووی بکات. لە ناخی خۆیدا دەیگوت "باوکە تۆ گەڕایتەوە".

مانی ئەو تابلۆیەی بە بیست و چوار ڕۆژ کێشا. تابلۆکەی بە بۆیەی زەیتی کێشا، لەسەر خامێکی (**100**م + **150**م). لە تابلۆکەدا کارۆس لەناو باخێکی پڕ لە گوڵزاردا ڕاوەستابوو. کاتێ تابلۆکەی تەواو کرد، هەستی ناتەواویی تابلۆکە غەمگینی کرد، لەو کاتەدا کارۆس لە تابلۆکەوە دەنگی هەڵبڕی "غەمگین مەبە کوڕە ئازیزەکەم، تابڵۆکە تەواوە، بە کەماڵ گەیشتووە". بە بیستنی ئەو قسەیە هێندە دڵخۆشبوو پڕ بە گەرووی هاواری کرد "ئیشراق، ئیشراق..".

ئەو تابلۆیە سەرلەبەری ژیانی مانیی گۆڕی، کارۆس لە تابلۆکەدا دەژیا، هەناسەی دەدا، دەگریا، پێدەکەنی، سەمای دەکرد، گۆرانی دەگوت، تەنانەت هەست بە بۆنی عەترەکەی دەکرا، بۆنی هەموو ئەو عەترانەی لێدەهات کە لە دووکانەکەی یەحیا عەترفرۆش هەبوون. کارۆس لەم تابلۆیەدا

هەندێجار جلەکانی سەرتاپا نیلی بوون، هەندێجار پانتۆڵ و کراسی شەکری دەپۆشی. هەر جارە جلێکی لەبەردا بوو، هەرجارە و ڕەنگێکی دەپۆشی. لە پشتی کارۆسەوە هەندێجار بایەکی فێنك و خاو سەمای بە گوڵەکان دەکرد، هەندێجار ڕەشەبایەکی بەهێز گەڵا و گوڵ و لقی درەختەکانی شەکەت دەکرد.
ئەوکاتانەش کە شار بۆنی بارووتی شەڕە ترسناکەکانی لێ دەهات گەردەلوولێك هەڵیدەکرد، نەك هەر کارۆس، بگرە گەردەلوول لە تابلۆکەشەوە دەهاتە دەرەوە و مانی و وێنەخانەکەشی دەشاردەوە.
ئەو کاتانەش کە شار لەئارامیدا دەژیا پەپوولەکانی ناو باخچەکە بە دەوری کارۆسدا دەخولانەوە و ئەویش سەمای دەکرد و مانیش لە خۆشیدا شاگەشکە و خەنان دەبوو.
لێرەوە ژیانی مانی دەستی پێکرد، ژیانێکی راستەقینە. مانی لەگەڵ باوکیدا دەستی بە ژیانێکی تازە کرد، ژیانێك بەردەوام لە گۆڕاندا بوو، بە یەکەوە گفتوگۆیان دەکرد و پێدەکەنین، گۆرانییان دەگوت و سەمایان دەکرد. کارۆس ڕێنمایی مانی دەکرد شادمان بێ و گوێ لە مۆسیقای دەروونی خۆی بگرێ، بگەڕێتەوە بۆ نێو خۆی، شەوان تا درەنگانێك بە یەکەوە سەمایان دەکرد، بەیانیان کارۆس مانی بێدار دەکردەوە..

مانی وردەوردە گەورە بوو، کارۆسیش هێواش هێواش پیر بوو، قژ و ریشی سپی بوو، هەندێجار ڕیشە سپییەکەی کارۆس ئەوەندە درێژ دەبووەوە لە تابلۆکە دەهاتە دەرەوە. مانی دەیگوت "باوکە ڕیشت زۆر درێژ بووە، ئەزانی؟" کارۆسیش بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە میهرەوە دەیگوت "دەزانم کوڕی شیرینم، دەزانم" کاتێ مانی بە دیار تابلۆکەوە خەوی لێدەکەوت، کارۆس بە مەقەست ریشی کورت دەکردەوە. ساڵانێك تێپەڕی و کارۆس بە تەواوی پیر بوو، مانیش بوو بە پیاوێکی تەواو، پیاوێکی گەردوونی. هەموو ژیانی ڕوانین بوو لەو تابلۆیە، کە دەروازەی گەردوون بوو. ئەوە دواهەمین تابلۆی مانی بوو. ژیانی مانی و کارۆسیش بەو شێوەیە درێژەی کێشا. تا شەوێکی ساردی زستان، تەڵەی فیتنەکان تەقی و شەڕ و ئاژاوە کەوتە نێو شارەوە، هاوشارییەکان دەستیاننایە بینەقاقای یەکتری. لە ئاسمانی ئەو شارەوە خوێن دەباری، کۆڵانەکان لافاوی خوێن بوون، هەموو شتێك ڕەنگی خوێنی گرتبوو. مزگەوت و کڵێساکانیان تەقاندەوە، کێڵگە نەوتییەکانیان تەقاندەوە. ئەو ڕوداوانە کارۆسیان وەها غەمگین کرد هەمیشە دەگریا. شەوێك دەنگی تەقە و هاوار و قیژە قیژە و تەقینەوە شاری تاساند، دەتگوت مەحشەرە، کارۆس بە بیستنی

دەنگی قیژە قیژ و هاواری خەڵکی زۆر غەمگین بوو، گریا، گریا، ئەو گریا و مانیش گریا... مانی بە گریانەوە خەوی لێکەوت، کارۆس هەر دەگریا... هێندە گریا، تا لە فرمێسکی خۆیدا نووقم بوو.
بەیانی کاتێ مانی لە خەو هەستا ویستی بەیانی باش لە باوکی بکات، بەڵام کاتێ سەیری تابلۆکەی کرد، حەپەسا. کارۆس بۆ کوێ چووە؟ تابلۆکە وێنەی دەریایەك بوو، دەریای فرمێسك. مانی بۆ دڵنیابوون دەستی بەسەر تابلۆکەدا هێنا، وەك ئەوەی دەست لە ئاو بخشێنێ. دەرکی بە تەڕی و شلی کرد، کاتێ پەنجەی بۆ دەمی برد هەستی بە سوێریی کرد، فرمێسك بوو. بۆ دۆزینەوەی باوکی روخساری لە تابلۆکە نزیك کردەوە و زیاتر رۆیشت و سەری بردە ناو تابلۆکەوە، وردەوردە هەموو جەستەی چووە ناو تابلۆکەوە، بە شوێن باوکیدا رۆیشت، تا ئەویش لەگەڵ کارۆس لە دەریای فرمێسکدا نوقم بوو .



جەنگەکان دەستیان پێ کرد
پیاوەکان شمشێر و خەنجەرەکانیان هەڵگرت و ڕۆیشتن
وەك ئەوەی بە دوای عەشقی ونبووی خۆیاندا بگەڕێن
وەك ئەوەی شەڕ بۆ ئەڤینی لەبیرکراوی خۆیان بکەن
لەناو ماڵە گەرمەکاندا تەنیا مانەوە ژنەکان
ئەلبوومی ناو سندووقە دارینەکان
هێنرانە دەرەوە
جارێکی دی و دوای چەندین سەدە خوێندرانەوە
نامەی شاردراوەی ناو سەرینەکان
پرچی هەڵگیراوی ناو قوماشە شینەکان
بۆن کران و هاتنەوە یاد شەوانی تارومار.

تۆ کە سەفەری ناو دەریا شینەکانت کرد
ماسییە سەوزوسوورەکانت
بۆ ژنەکانی هاروون بردەوە
لەگەڵ کەنیزەکەکانیدا خەوتی
گۆزەی شەرابت لەگەڵدا خاڵی کردنەوە
شەوان لەسەر لەشی ڕووتیان بۆ من دەگریایت
جگەرەت دادەگیرساند و
لە ئەستێرە کوژاوەکانت دەڕوانی؛
چون دەتزانی بەختەوەر نیت.



بیرت لە کراسە ڕەشەکانم کردەوە
کە لەناو دەستەکانی تۆدا تەڕ دەبوون
بیرت لە ئەڤینی بەدەنگهاتووی من کردەوە
کە وەك سێبەری مردووان بە دواتەوە بوو.

پیاوان دەچوون بۆ جەنگ
تا دونیامان بۆ بگۆڕن
تا میراتی ماڵەباوانیان وەربگرنەوە
وێرانە بوو باخچەکانیان
خشتی سووری کۆشکەکانیان درزیان بردبوو
ئێمە لەژێر داروپەردووی ئەو وێرانەیەدا
منداڵەکانمان لە داوێن دەکەوتە خوار.

ئێستایش من نازانم تۆ لە کوێیت
لە کام بەندەر ماسی بۆ ژنەکانی هاروون دەگریت
من منداڵی تۆم هەڵگرتووە و شاران دەگەڕێم
خۆشەویستم!

کە خامۆش بوو ئاگری جەنگەکان
کە بە شیر و ڕمی خوێناوییەوە گەڕانەوە
جەنگاوەران



لە هاوڕێیەکانت دەپرسم هەواڵی تۆ
دەگەڕێم بۆ شوێنپێیەکانت
تا بدۆزمەوە و ناوی منداڵەکەت پێ بڵێم
چونکە بیرکردنت لەناو ڕەحممدا
کاری خۆی کردووە.

ڕۆژانی پێش جەنگم لە بیر ناچن
لەناو پێدەشتەکاندا بانگم دەکردیت:
ئاروون!
وای ئاروون!
ناوی تۆ لەناو دەممدا
وەك خواردنی شاتووە سوورەکان خۆش بوو.

لەسەر بەردەکان دادەنیشم و
بە دەنگی بەرز ناوت دەهێنم
ئەکیلیس!
بۆنی عەترەکانم کاڵ بوونەوە و
تۆ بۆنی لەشی منت لە یاد کرد
لەسەر جێیەکەم ماوە بۆنی پێستی تۆ
لە سێبەری پیاوان سڵ ناکەمەوە
ئەکیلیس!
ئەڤینی تۆ لە تیرەکان دەمپارێزێت



من کە پێکراو و کوژراوی تیری تۆم
خۆشەویستم!

جەنگەکان تەواو بوون
شمشێر و خەنجەرە خوێناوییەکانیان هێنانەوە
جارێکی تر عەترەکانمان لە گەردن دان
ڕەنگی سووراو و قژمان گۆڕین
لە یادیان نەمابوو پێش جەنگ چۆن بووین
وەك ئەوەی بە دوای عەشقی ونبووی خۆیاندا گەڕابن
وەك ئەوەی شەڕیان بۆ ئەڤینی لەبیرکراوی خۆیان کردبێت
پیاوەکانمان.





# نورەدین فارەح نووسەرێك لە دڵی نەهامەتییەکاندا

**عەتا محەمەد**

هەندێك وڵات هەیە لەلایەنی سیاسییەوە داخراوە و مرۆڤ بە ئاستەم دەزانێت چی لەو سەرزەمینە دەگوزەرێت. بەڵام وڵاتانێکیش هەن لەسەر نەخشەی گێڕانەوە و ئەدەب فەرامۆشکراون و لە یادەوەریی بەشێکی زۆر لەخوێنەراندا ئامادەییان نییە، وەك سۆماڵ.




ئەو وێنە زاڵەی سۆماڵ لە خەیاڵی ئێمەدا هەیەتی، وێنەی وڵاتێکی برسی و بێبارانە، وێنەی وڵاتێك لە شەڕێکی ناوخۆی نێوان خێڵەکان و ئەوانەی بە بازرگانانی شەڕ ناودەبرێن، شەکەت کراوە. وڵاتێك لەسەر کۆمەکی وڵاتانی تر دەژی و مرۆڤە وشك هەڵهاتووەکانی هەمیشە بەقاپێکی قوپاوەوە لەسەرەی خواردن وەرگرتندا وەستاون. لە کەنارەکانیدا هێشتا چەتە دەریاییەکانی، کەشتی و پاپۆڕەکان تاڵاندەکەن و دەڕفێنن. وڵاتێك هەرکەس بیەوێت دەستی تێوەردەدات و دەوڵەتێکیش بەڕێوەی دەبات، کە هیچ بنەمایەکی دەوڵەتی تێدا نییە. لەم دوو سێ ساڵەی پێشوودا، بەرێکەوت ئەو هەواڵەم خوێندەوە، کە حکومەتی سۆماڵ گلەیی لە وڵاتە عەرەبییەکان دەکرد، بەوەی مانگی دوو ملیۆن دۆلار کۆمەکی نادەنێ تا بتوانێت خۆی بەڕێوەبەرێت و مووچەی ئەندام پەرلەمانەکانیشی بدات.

ساڵانێك لەمەوبەر بەدوای ئەوەدا دەگەڕام بزانم لەوڵاتێکی وادا، نووسەرانێك هەن لە هەناوی ئەو کارەساتانەوە لەدایك بووبن، کە ئەو وڵاتە تێیدا ژیاوە و دەژی: شەڕی ناوخۆ، برسێتی، گەندەڵی و پێکهاتەی خێڵەکی ئەو وڵاتە. ئەوەبوو زیاتر ناوی "نورەدین فارەح"م دەبینی، کە وەك نووسەرێکی بەناوبانگی سۆماڵی و ئەفریقی باسدەکراو وەك دەڵێن چەند جارێك بۆ خەڵاتی نۆبڵ پاڵێوراوە، بەڵام من هیچ رۆمانێکیم نەخوێندبووەوە، "من لە شوێنی تردا وتوومە، کە دەشێت ناوبانگ یارمەتیدەرم بێت بۆ زوو دۆزینەوەی نوسەرێك، بەڵام هەرگیز خۆم نادەمە دەست ئەو سیحرەی خەڵات بۆ نوسەرێکی دروستدەکات". سەرەتای ئەم ساڵ، کاتێك هاوڕێم ماردین ئیبراهیم لەلام میوان بوو، شەوێك بەدەم گفتوگۆوە لێیپرسیم: نورەدین فارەح دەناسیت؟ منیش وتم: تەنها وەك ناو.. چونکە هیچیم نەخوێندۆتەوە. دوای ئەوە کەڵکەڵەی خوێندنەوەی نوردەین فارەحی سۆماڵیی بە ئینگلیزینووس کەوتە سەرم و بڕیارمدا بەدوای رۆمانەکانیدا بگەڕێم. ئەوەبوو توانیم سێینەیەکی پەیدابکەم و بیخوێنمەوە، کە لەم رۆمانانە پێکهاتووە: "نەخشەکان، دیارییەکان، نهێنییەکان". مەبەستم بوو بزانم چی لەو سەرزەمینە هەیە، کە من هیچ لە دنیای نووسینی نازانم و ئاگاداری نیم. ئەگەرچی پێشتر کتێبێکم لەبارەی ئەو خەتەنەکردنە درندانەیەوە خویندبووەوە لەو وڵاتەدا دژ بە ئافرەت دەکرێت و بەخەتەنەکردنی فیرعەونی

ناودەبرێت.
نورەدین فارەح بە یەکێك لە پێشەنگەکانی قوتابخانەی دوای کۆلۆنیالی دادەنرێت و سەلمان روشدیش بە رۆماننوسێکی گرنگی ئەفریقای دادەنێت. ئەو ساڵی **1945** لە باشوری سۆماڵ، لەشاری بیدوا لەدایك بووە. باوکی بازرگان و دایکیشی شاعیربووە. فارەح ساڵی **1994** لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: ئەگەر رێکەوت نەبوایە، ئەوا دەبوومە نوسەرێکی عەرەبی زمان. لە گەنجێتیدا ڤیکتۆر هۆگۆ و دیستۆفسکیم بەم زمانە دۆزییەوە و دەقەکانی سەرەتاشم هەر بەم زمانە نووسی. بەڵام ئەوکاتەی بڕیارمدا ببمە رۆماننوس، ویستم ئامێرێکی چاپ بکڕم. لەو سەردەمەدا، واتا شەستەکانی سەدەی بیست، مەحاڵ بوو لە مەگەدیشۆ ئامێرێکی چاپ بدۆزیتەوە پیتەکانی عەرەبی، یاخود ئەمهەری بێت، "ئەمهەری زمانی فەرمیی ئەثیوبیایە و دیارە ئەو دوو وڵاتەش گرفتی زەوی و سیاسی لەنێوانیاندایە". زمانی نووسینی سۆماڵییش لە حەفتاکاندا جێگیر دەکرێت. ئەمەش وای کرد بە ئینگلیزی بنووسم. فارەح نەیویستووە بە زمانی ئەمهەری بنووسێت، کە دووەم زمانە دوای عەرەبی فێری بووە. چونکە بە زمانی دوژمنانی سۆماڵی زانیوە.
پێشتر وتمان ئەو دایکی شاعیر بووە، بەڵام بەو مانایە نا، کە وشەی شاعیر لە خەیاڵی ئێمەدا ئامادەیی هەیە، بەوەی کەسێك بووبێت لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا شیعری بڵاوکردبێتەوە. بەڵکو ئەو لەو ژینگە بچوك و زارەکییەی تێیدا ژیاون، شیعری بۆ بۆنەی هاوسەرگیری، لەدایکبوونی منداڵ و شتی رۆژانە هۆنیوەتەوە و بە نورەدینی لەبەر کردووە، تا بچێت بۆ لای ئەو کەسانەی داوای شیعرەکەیان لێکردووە، بۆیان بخوێنێتەوە.
ئەوکاتەی نورەدین لەدایك دەبێت، سۆماڵ لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا دەبێت، پاش ئەوەی ئیتالیا لە جەنگی جیهانی دووەمدا دەدۆڕێت و سۆماڵ دەکەوێتە دەست بەریتانییەکانەوە. باوکی وەك وەرگێر لای بەریتانییەکان کاری کردووە و دواتر کێڵگەیەك لە ئەثیوبیا دەکڕێت و دەچن لەوێ دەژین. لەوێ نورەدین بەیانیان دەچێت بۆ قوتابخانەیەکی ئینگلیزی و دوای نیوەڕوانیش دەچێت بۆ حوجرە. ئەو دەڵێ: من لەناو ئەو دژ بەیەکییەدا دەژیام: ئینجیل و قورئان لەیەك کاتدا. لەلایەك شکسپیر و لەلایەك شاعیرە عەرەبەکان و ئێوارانیش گوێم لە گۆرانیی سۆماڵی و شیعرەکانی دایکم دەگرت. "دیارە لەوێش فێری زمانی ئەمهەری دەبێت". نورەدین لە میانەی ئەم خوێندنەیەوە، دەگاتە ئەوەی بڵێ "لەنێوان ئەو دوو کتێبەدا زۆر ئەفسانەی هاوبەش هەیە". ئەو دەڵێت: لە دوانزە ساڵیدا





بەعەرەبی تاوانو سزای دستۆفسکیم دەخوێندەوە و ئەوەی زۆر سەرسامی دەکردم، وەسفی بەفر بوو. بەوپێیەی من بەفرم نەبینیبوو، هەستم بە هەژاری دەکرد. ئیدی ئارەزووی نووسین لەلام، لە ئارەزوی دۆزینەوەی جیهانێکەوە سەرچاوەی دەگرت، کە هەر منداڵێکی سۆماڵی بتوانێت خۆی تێدا بدۆزێتەوە. بەتایبەت دوای ئەوەی زانیم حیکایەتەکانی کتێبە دڵپەسەندەکەی من "هەزارو یەك شەوە"، سۆماڵی نین.

نورەدین فارەحی سۆماڵی لەناو کلتورێکدا لەدایك دەبێت، کە کلتورێکی زارەکییە، بەڵام فارەح زۆر شەیدای نووسین دەبێت و دەگێڕێتەوە: لەگەڵ ئەوەی زۆر سەرسامی کتێبی هەزار و یەك شەوە بووە، بەڵام لەوە زیاتر، بوونی ئەو کەسە بووە تێیدا، کە وەك ئەم ناوی نورەدینە. فارەح دەڵێت: زۆرجار لەکاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا کە دەگەشتمە ئەو ناوە، ئەوا دەمبڕی و دەملکاند بە دەفتەرەکەمەوە تا نیشانی هاوڕێکانمی بدەم و پێیان بڵێم سەیرکەن ناوی من چاپکراوە، دەزانن من نوسەرم. چەند جاریش سزا دەدرام، لەبەرئەوەی کتێبەکەم دڕاندبوو. لەوانەیە نووسین لای من لەو گاڵتەیەوە سەرچاوەی گرتبێت، کە بە هاوڕێکانمم دەوت من نوسەرم.

کاتێك تەمەنی دەبێت بە 17 ساڵ و شەڕی نێوان ئەثیوبیا و سۆماڵ هەڵدەگیرسێت لە 1963دا، خێزانەکەی ناچاردەبن بگەڕێنەوە بۆ سۆماڵ و هەموو شتێك لەدەست بدەن. نورەدین وردە وردە دەست بەنووسینی کورتە چیرۆك دەکات، تا دوای دوو ساڵ لەگەڕانەوەیان بۆ مەگەدیشۆ، فرسەتی خویندنی لە دوو شوین بۆ هەڵدەکەوێت: یەکێکیان لە زانکۆی وێسکۆنسی وڵاتە یەکگرتووەکان تا ئەدەب و رۆژنامەنووسی بخوێنێت، ئەویتریشیان لە زانکۆیەکی هیندی تا فەلسەفە بخوێنێت. نورەدین دەڵێت: خەڵکی خەونی بە ئەمریکاوە دەبینی، بەڵام من ئەوەی هیندم هەڵبژارد. من پێشتر لە مەگەدیشۆ ئەو سۆماڵیانەم بینی بوو، لە ئەمریکا و ئەوروپاوە گەڕابوونەوە و خۆیان وەك شێت و شەیدای پاکوخاوێنیی نیشان دەدا، تەنانەت هەیان بوو پێش تەوقەکردن لەگەڵ خزمەکانی، دەستی دەشۆرد، بەڵام من لەو کەسانەم بەچاوی رێزەوە سەیری خەڵکی دەکەن. پاشان من پێشتر رۆمانێکی سۆمەرست مۆمم خوێندبووەوە، کە باس لە گەڕیدەیەکی بەریتانی دەکات، چۆن دەچێت بۆ هیندستان و لەوێ فەلسەفەی هیندی کەشف دەکات. ئەو رۆماننوسەش لە رۆماننوسە دڵپەسەندەکانم بوو. منیش چووم بۆ هیندستان و چوار ساڵم لەوێ بەسەربرد و یەکەم رۆمانیشم لەوێ نووسی.

کاتێك نورەدین دەگەڕێتەوە بۆ سۆماڵ، هاوکاتی گرتنەدەستی دەسەڵات دەبێت لەلایەن "سیاد بەڕی"یەوە. ئەو دانبەوەدا دەنێت کە لەوکاتەدا هاوسۆزی شۆڕش دەبێت و بۆشی دەنووسێت. لەساڵی 1970دا ڤیستیڤاڵێکی لاوان لەسەر شێوەی ڤیستیڤاڵەکانی سۆڤییەت رێکدەخرێت، بەوەی نزیکەی پێنج هەزار لاو کۆدەکرێنەوە و ئاڵا دەشەکێننەوە. نوردەینیش وەك ئەوان لەژێر کاریگەریی ئەو حەماسەدا دەبێت. نورەدین دەڵێت: بەڵام زوو گڕی ئەو جۆش و خرۆشەم دامرکایەوە، ئەویش کاتێك نەهێڵدرا شانۆگەرییەکەم بەبیانووی ئەوەی کاراکتەرێکی سەرخۆشی تێدایە، نمایش بکرێت.
یەکەم پرۆژەی رۆمانی نورەدین، چوار کتێب دەبێت لەبارەی دیکتاتۆرییەتەوە، کاتێك بەشی یەکەمی "دەرزی سیلاوی ـ لە هەندێك شوێندا بە دەرزی رووت وەرگێڕدراوە" لە ساڵی 1972 دەنێرێت بۆ بڵاوکەرەوەی "هاینمان" لە لەندەن، پێیدەڵێن جارێ چاوەڕێ دەکەین تا سۆماڵ بەجێبهێڵیت. وادەبێت لە 1974دا نورەدین دەگاتە لەندەن تا درێژە بەخوێندن بدات. کتێبەکەشی لە 1976دا بڵاودەکرێتەوە. نورەدین دەڵێت: ئەوکاتە رەشنووسی یەکەمی رۆمانی "شیرو ماست"م تەواو کردبوو، دەمویست بگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ. من ئاگام لەوە نەبوو سەفارەتی سۆماڵ لە لەندەن راپۆرتی لەسەر نووسیوم، دوای ئەوەی چەندین وتار لەبارەی ئەو رۆمانەمەوە نوسرابوو، هەندێکیان وایان لە قەڵەم دابوو کە گاڵتە بە سیاد بەڕی و دەسەڵات دەکەم. لە ئیتالیا تەلەفونم بۆ براکەم کرد تا لە فرۆکەخانە چاوەڕێم بکات. بەڵام ئەو ئامۆژگاریی کردم، کە دۆخەکە لەبار نییە و هەشت رۆژ چاوەڕێ بکەم. ئەو هەشت رۆژە بوو بە بیست ساڵی رێك. بەوەی حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا دەدرێت. ئیدی نورەدین ئاوارە دەبێت تا لە باشوری ئەفریقا دەگیرسێتەوە و لە 1996دا، دەتوانێت بۆ یەکەمجار سەردانی سۆماڵ بکاتەوە.
لێرەدا دەمەوێت تەنها کەمێك لەبارەی رۆمانی "دیارییەکان"ەوە بدوێم و لە دوو رۆمانەکەی تر "نەخشەکان و نهێنییەکان" دەگەڕێم، تا ئەگەر خوێنەر ئارەزووی لێبوو خۆی بیانخوێنێتەوە.
دەکرێت لە روویەکەوە بڵێین نورەدین فارەح سەر بەو دەستە رۆماننوسانەی وەك یەشار کەماله، کە لە رێگای خوێندنەوەی رۆمانەکانییانەوە، دەتوانین وێنایەك لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگاکەیان وەربگرین. ئەگەرچی خەیاڵ رۆڵی هەیە لە پشت دەقەکانیانەوە، بەڵام ئەوان لەرێگای ژیان و چارەنووسی کەسایەتییەکانیانەوە، دەگەڕێنەوە بۆ سەر دابو نەریت، حیکایەت و وردەکاریی





کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان. فارەح لەو نوسەرانەیە گرنگییەکی زۆر بە بارودۆخی ئافرەت دەدات و زۆر لەو زوڵم و چەوساندنەوەیە دەدوێت، کە رووبەڕووی دەبنەوە. خاڵێکی جوان لای فارەح، گەڕانەوە و بەکارهێنانی حیکایەت و بیروباوەرە میللی، یاخود ئەفسانەییەکانە. هەرچۆن باسی داگیرکەر و ئەو گرفتانە دەکات، لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن یاخود بەجێیدەهێڵن، شەڕی ناوخۆ، نەهامەتی و وشکەساڵی و وردەکاری ژیانی سۆماڵییەکان...

بەبڕوای من رۆمانی دیارییەکانی فارەح، رۆمانێکی سەرنجڕاکێشە. لەبەرئەوەی کرۆکی رۆمانەکە لەسەر چەمکی "دیاری" یاخود "پێبەخشین" وەستاوە. فارەح قوڵ و جوان کار لەسەر ئەم چەمکە دەکات. ئێمە کاتێك بیر لەسۆماڵ دەکەینەوە، ولاتێکمان دێتە بەرچاو کە هەمیشە چاوەڕوانە ولاتانی تر "پێیببەخشن". ئایا ئەو پەیوەندییە چییە لەنێوان ولاتانی دەوڵەمەندی بەخشندە و سۆماڵی هەژاری "پێ بەخشراو"دایە؟ فارەح زۆر بەوردی لەم پەیوەندییە ورد دەبێتەوە.

رۆمانەکە لە کۆمەڵێك بەش پێکدێت، کە لە کۆتایی هەر بەشێکدا، هەواڵێکی کورتی رۆژنامەیەك، یاخود راپۆرتێك سەبارەت بە دۆخی سۆماڵ، داواکردنی یارمەتی یاخود ئەگەری گەشتنی یارمەتی و لەبارەی برسێتییەوە هەیە. واتا فارەح هەوڵیداوە ئەو کارە رۆژنامەییانە زۆر جوان لە بینای رۆمانەکەدا بەکاربهێنێت.

ئایا ئەوەی دەبەخشێت، هیچ داواکاری نییە و پێبەخشراو ملکەچ ناکات؟ ئایا ئەوە پەیوەندییەکی پاك و بێ مەلامەتە لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا هەیە؟ ئایا ئەمیان چی دەوێت لەویان؟

پێمان وانەبێت فارەح دێت لە رێگای بابەتی گەورە و زەقی سیاسی و ئابورییەوە کار لەسەر بابەتێکی وەك بەخشین یاخود دیاری بکات. نەخێر، ئەو لەرێگای ژیان و پەیوەندییەکانی خێزانێکەوە رووداوەکان دەچنێت. رۆمانەکە لە مەگەدیشۆ و کاتی بێ کارەبایی، بێ بەنزینی، ترس‌و نەبوونی خۆراکە لە بازاڕدا. فارەح لەرێگای "دونیا"وە وردە وردە دەمانباتە ناو سۆماڵەوە.

دونیا ئافرەتێکە دووجار مێردی کردووە و سێ منداڵی هەیە. کوڕ و کچێکی لای خۆی دەژی و کچێکی تریشی لە ماڵی برای مێردەکەی دەژی، کە منداڵیان نابێت و لەکاتی جیابوونەوەی دونیا لە تاریق، لەسەر ئەوە رێکدەکەون ئەو منداڵە بدات بەوان. لەلایەك لەبەرئەوەی ئەوان منداڵیان نابێت، لەلایەکی تریشەوە بۆئەوەیە ئەوان باری ئابووریيان باشەو کەمێك باری شانی دونیا کەم بکەن. پاشان ئەو

خانووەی دونیا تێیدا دەژی ئەوان خاوەنین، "دواترو لە ئاستێکی قوڵدا تێدەگەین هەموو ئەو شتانە چەمکی ـ دیاری، بەخشین-لە پشتیانەوە وەستاوە، بەوەی ئەم منداڵیان پێدەبەخشێت، ئەوانیش ڕێگەی دەدەن لە خانوەکەدا بژی". پاشان دونیا یەکەم شووی لەسەر قسەی باوکی لەسەرەمەرگدا، دەدرێت بە هاوڕێیەکی باوکی، کە دیارە زۆر لە دونیا گەورەترە و پیرێکی نابینایە. دونیا قسەی باوکی ناشکێنێت و بەرەزامەندی خۆی شووی پێدەکات. کاتێك دونیا منداڵ دەبێت، نابیناکە ئەسپێکی جوانی هەیە و دونیا زۆر حەزی لێیەتی، نابیناکە دەبێت ئەو ئەسپە ببەخشێت، تا دونیای دەستبکەوێت. هەرچۆن برای دونیا دەبێت دونیا ببەخشێت تا پارەی دەستبکەوێت. زۆر ڕوداوی ڕۆمانەکە لەسەر چەمکی پێبەخشین بیناکراوە. تەنانەت کە ڕۆمانەکە دەستپێدەکات، دونیا لە خەستەخانەیەکی دوور لە ماڵی خۆیان کاری سستەریی دەکات. بۆساسۆی دەوڵەمەند و ڕۆشنبیر دەیەوێت لەو دۆخە ناخۆشەدا کۆمەکی بکات، ئەویش بەوەی جارجار بۆ خەستەخانەی بگەیەنێت، چونکە لەو بارودۆخەدا، کە ئاسایش نییە، گرفتی کەمی تاکسی و پاس بۆ هاتوچۆ بەهۆی نەبوونی بەنزینەوە، ئەگەری هەیە ئافرەتێکی تەنیا لە شەقامەکاندا تووشی لاقەکردن ببێتەوە، ئەم هەڵسوکەوتەی بۆساسۆش هەر لەو پەیوەندییەدایە، کە دیاری یاخود بەخشین دروستی دەکات. هەربۆیە دونیای قوربانیدەر و ئازا لەبەرانبەر ژیاندا، لەوە تێدەگات کە هیچ بەخشینێك بێ مەبەست نییە و هەمیشە ئەوانەی دەبەخشن، هەست بە سەرکەوتووی و بەرزی دەکەن بەسەر کەسی پێبەخشراودا، یاخود شتێکیان لێیان دەوێت. لەبەرئەوە دونیا لەبەرانبەر ئەوەدا، جار جار لە ماڵەوە



بۆساسۆ داوەتی نان خواردن دەکات. چونکە نایەوێت ببێتە کەسێکی پاشکۆ، بەڵکو دەیەوێت خۆی خاوەن بڕیاری خۆی بێت و "دیاری" تووشی بەستنەوە یاخود ملکەچی نەکات.
ڕۆمانەکە لەڕیگای گرفتی خێزان، تەلاق، پەیوەندی نێر و مێ و خزمایەتی و.. لە سۆنگەی چەمکی دیارییەوە بەسەر دنیای سۆماڵیدا دەکرێتەوە و لەگەڵیدا ڕۆدەچێتە ناو گرفت و کێشە سیاسی و ئابورییەکانەوە. دەگەڕێتەوە سەر ئەفسانە و حیکایەتی کۆنی ئەفریقی و سۆماڵی. ڕۆژێك کچەکەی دونیا منداڵێکی فڕێدراو هەڵدەگرێتەوە، دونیا ئەمە وەك بەخششێکی خواوەندیانە دەبینێت و دەیەوێت بەخێوی بکات. ئیدی زۆر چیرۆك لەبارەی ئەو منداڵەوە ئەندێشە دەکاتو وەك "ڕزگارکەر" سەیری دەکات و دەیبەستێتەوە بە موسا پێغەمبەرەوە، کە هەروەك ئەم منداڵە، ئەویش فڕێدراوبووە. لەلای پۆلیس، منداڵەکە












بەناوی دونیا و بۆساسۆوە تۆمار دەکرێت. بەڵام منداڵەکە دەمرێت و دەرگای کۆمەڵێك گرفت بەڕوی دونیادا دەکاتەوە.

لە ڕۆمانەکەدا وتارێکی جوان هەیە لەبارەی "دیاری یاخود پێبەخشین"ەوە، کە تاریقی ڕۆژنامەنووس و کۆنە مێردی دونیا لە ڕۆژنامەیەکدا بڵاوی کردۆتەوە.

وەك پێشتر وتم، لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانەدا، هەستدەکەیت فارەح دەروازەیەکت لێدەکاتەوە، نەوەك تەنها بەسەر سۆماڵدا، بەڵکو بەسەر ئەو پەیوەندییەی لەسەر دیاری و بەخشیین وەستاوە. هەرچۆن لەوەش تێدەگەیت، کە سۆماڵ ئەگەرچی وڵاتی شەڕی ناوخۆ و برسییەکانە، بەڵام کەسانێك هەن بیردەکەنەوە و رادەمێنن.



# دونیای کاراکتەرەکانی منداڵانی گەڕەکی هیوا قادر

## سەردار عەزیز

منالآنی گەڕەك رۆمانێکی رۆماننوس و شاعیر هیوا قادرە. لە توێی دەقەکەدا سێ کاراکتەر تیایدا بەیەك دەگەن. سەرەتا سیسیلیایە، ئافرەتێکی چەپی، سویدی، پونکە. دووەم، باوکیەتی، کە دوکتۆرێکی دەروونناسی بە رۆماننوس بووە. سێیەم گوڵ محەمەد کە پەنابەرێکی کوردە. شوێنی رووداوی رۆمانەکە وڵاتی سویدە، بە پەلوپۆ هاوێشتن بە جێگاکانی تر لە رێگای یادەوەری و خەیاڵ و یادگاریەوە.

سەرەتا

دوای کارە ناوازەکەی ئیدوارد سەعید قسەکردن لە سەر سەرەتا کاری ئەدەبی بوەتە کارێکی جێی بایەخ. ئایا سەرەتا ئەو خاڵەیە کە نەدەتوانرا، خاڵێکی تر لە بڕی وەك سەرەتا هەڵبژێردرێت؟ سەرەتا دوفاقیە: لەیەکدا دەستپێکردن و لە هەمانکاتدا کۆتاییشە. سەرەتای دەقی ئەدەبی، هێندە کاریگەرە ئەو ئینتیباعەی دروستی دەکات پاشتر بە سەر سەرتاپا کارەکەوە دەمێنێتەوە. سەرەتای



رۆمانەکەی هیوا لە ئاودەستەوەیە. پاش ژیژاك جێگایەکی وەك ئاودەست و پاشەڕۆ و پیسایی نرخی خۆی وەرگرتوە لە دونیای دەربڕیندا.
ئەوەی ژیژاك پێمان دەڵێت ئەوەیە کە لە شوێنێکی وەك ئاودەستدا وەك هەموو شوێنێکی تر نێو سیستەمی باڵا، کە سەرمایەداریە، ئەم سیستەمە ئامادەیی هەیە لە دارشتنی، چۆنێتی پەیوەندیکردن پێوەی، یان دەرهاوێشتنی پیسایی.
گەر لەم چوارچێوەیەدا بمێنینەوە. ئەوا کاری پیساییکردن لای سیسیلیا ساتەوەختی ناسینی سیسیلیایە، بە جۆرێك کە ڕەنگە هیچ کردارێکی تر بەو باشیە نەتوانێت پێمان بناسێنێت.
لەوێدا مامەڵە لەگەڵ جەستە، ئیستاتیکای جەستە، پەیوەندی لە گەڵ مۆدی باو هەموو بە باشی روون دەبێتەوە.
من مەبەستم نیە لە رووی ڕەخنەی ئەدەبیەوە قسە لە سەر دەقەکە بکەم. بەڵکو ئەوەی من بە کورتی قسەی لەسەر ئەکەم پەیوەندی نێوان سێ کاراکتەرەکەیە. هیچ کام لە کاراکتەرەکان کەسی ئاسایی نین.
سیسلیا لە باڵی چەپی پونکە کە بێ دایك و بێ باوك گەورە بوە. دوکتۆرە رۆماننوسەکە پیشەکەی و پەیوەندی و چالاکیەکانی نیشانەی ژیانی چینی ناوەندی باڵای کۆمەڵگای رۆژئاوایە، لە هەمانکاتدا بەرجەستەبوونی دەسەڵاتە.
گوڵ محەمەد پەنابەرە، مرۆڤێك دارِن بوو لە خۆی کە بە دوای ئەوەدا دەگەڕێت لە رێگای کەسێکی ترەوە بتوانێت بگاتەوە خۆی، بۆیە چ وەك نەخۆشێکی دەرونی کلاینتی باوکی سیسیلیایە، پاشان چ وەك کەسێکی خاوەن سەربوردە. گوڵ محەمەد لە رێگای سەربوردەکەیەوە دەیەوێت بگاتە خۆی. خۆی ناتوانێت سەربوردەکەی بەرجەستە بکات وەك شوناسێك بۆیە پێویستی بەوە هەیە کە لە میانەی دەسەڵاتێکی ترەوە، ناوەندێکی ترەوە جارێکی تر بگاتەوە خۆی. ئەم کردەیە وەك کردەیەکی ئاگایی نایەتە بوون بەڵکو زیاتر وەك کردەیەکی دەروونی بەرجەستە دەبێت. سەعید پێمان دەڵێت کە نەتەوە لە رێگای گێرانەوەوە خۆی بەرجەستە دەکات، گوڵ موحەمەد کە خۆی تێکەڵەیەکە لە کوردبوون هەمان خواستی هەیە، دەیەوێت خۆی بگێڕێتەوە، بەڵام خۆی بگێڕێتە و لە میانەی دەسەڵاتدا بگێڕێتەوە بۆ ئەوەی بنوسرێتەوە، دارێژرێتەوە، بڵاوبکرێتەوە .
پونك باڵێکی چەپی رادیکاڵە کە لە رێگای جل و مۆسیقا و ڕەوشی ژیارەوە

بەرگری و یاخی بوون و تاکێتی پێشان ئەدەن. سەرەتا ئێمە سیسیلیا لە ئاودەستدا دەناسین، جیگایەك تیایدا پەیوەندی بە دونیاوە پەیوەندیەکی خۆ بەتاڵکردنەوەیە لە رێگای فرێدانی پیساییەکانی ناو جەستە. ئاودەست جێگایەکی باشە بۆ ناسینی کەسێکی پونك چونکە لەوێدا ئێمە تایبەتمەندی، بێزاری، نەخوازراو، شاراوە، بێزای دەربڕین هەموو دەبینین. لە دەرگای ئاودەستە گشتیەکان دەبینی خەڵك ئەوەی ناوێرن بیڵێن دەینوسن، لێرەدا تەباییەك هەیە لە نێوان پیسایی و دروشم .

پونك بوونی ئەم کچە ئاماژەیە بۆ بوونی لە قەراخ کۆمەڵگای سویدیدا. ئەم قەراخ بوونە دەرئەنجامی ژیانی تایبەتی و ژیانی یان پەیوەندی نێوان دایك و باوکیەتی. سیسیلیا پاش خیانەت لە دایك دەبێت بەڵام سەر بە خیانەتکارەکە نیە. وونبوونی دایك وەك قوربانی خیانەتەکە، هەرچەندە دایکەکە خیانەتکارەکەیە، نیشانەی ئەو باوکسالاریەیە کە لە کۆمەڵگای ئازادا بوونی هەیە. بەپێی ئامارەکان سوید زۆر رێژەی لاقەکردنی تیادا رووئەدات، رەنگە هۆکارەکەی بۆئەوە بگەرێتەوە کە هەندێك کار بە لاقە ئەژمار دەکرێت، لە جێگایەکی وەك کامپی زانکۆکانی ئەمریکا بە ئاسایی لە قەڵەم بدرێت.

پونك بوونی، نەخوازراوی، ئافرەتبوونی، هەموو سیسیلیا وەها لێدەکەن کە لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا هێندە بچێتە خوارەوە هەتا وەك پەنابەرێك هەست بە تەنهای بکات. پەنابەر ئەو کەسەیە لە ئەمرۆی رۆژئاوادا کە ئەگامبین وەك



هۆمۆساکەر دەیبینێت. کەسیك کە دادگاکان هێندە بایەخ بە رەوتی ژیانی نادەن مەگەر تەنها بۆئەوەی بیکەنە مرۆڤێکی ئاسایی.

پەیوەندی نێوان کچ و باوکەکە نیشانەیەکی روونی پەیوەندی نێوان چینی چەپ یان چەپی یاخی و چینی دەسەڵاتدارە لە سوید. پەیوەندیەك کە هاوبەشیەکی هەیە بەڵام لێکدابران و نەفرەت و بیرکردن بۆ یەکتری و خواستی بەیەکگەیشتن و سڵکردن لە بەیەکگەیشتنەوە و نەبوونی توانا بۆ ژیانکردن لە دونیای یەکتردا بەڵام ناچاربوون لە یەك وڵاتدا هەموو بە روونی لە پەیوەندی سیسیلیا و باوکیدا دیارە.

سیسسیلیا وەك چەپێکی توندڕەو نە رەگی هەیە، نە شوناس. دەزانێت بەرهەمی نەفرەتێکە، کە ئەو تاوانی تیادانیە، بەڵام دەبێت سزاکەی بچێژێت. هەمان چیرۆك لە چیرۆکی تاوانباربوونی مرۆڤ دەچێت لە ئاینی مەسیحیدا. هەموو کەسێك تاونبارە بە گوناهی سەرەتا.

هەرچی کەسی باوکە، کە دەروونناس و رۆماننوسە، هەموو





خەسڵەتەکانی دەسەڵاتی باڵای تیادایە. کە دەرووناسە ئاگای لە نهێنیەکانە، توانای بایەخدان و یارمەتی هەیە، پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیتردا پەیوەندیەکی نەخۆش و ساغە. تا سەر ئێسقان فۆکۆییانەیە. پاشان کە دەبێتە رۆماننوس دیسانەوە دەبێتە خاوەن مافی گێرانەوە، مافی مانا بەخشین، مافی داهێنانی کاراکتەر، مافی دروستکردنی وێنا و هۆنینەوەی حەقایەت. گەر ئێدراورد سەعید دەڵێت نەتەوە گێڕانەوەیە، ئەوا ئەم یەکێکە لە گێڕەرەوەکان.
پێکەوەبوونی ئەم سێ کاراکتەرە پێکەوەبوونی دەسەڵاتە لە بونیادی کۆمەڵگادا. دەبینی چۆن سیسیلیا بەر نەفرەت دەکەوێت و توربوون و نەفرەتکردن دەبێتە قاڵبدەری ژیانی، چۆن گوڵ موحەمەد کوردبوونی دەیکاتە پەنابەر و پاشان بابەتێکی دەسەڵات، چ وەك خۆی چ وەك خەڵکێك.
رۆمانەکەی هیوا قادر لە رێگای سەربوردە و پەیوەندی ئەم سێ کاراکتەرەوە ئاڵۆزیەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، ئاڵۆزیەکانی پێکەوەبوون، هەروەها مەحاڵێتی بوون لە دونیایەکی لەم جۆرە دەسەڵاتەدا دەخاتە ڕوو.



# بێدەنگی من و غەڵبەی ئەوانی تر

**بەیان سەلمان**

زۆرکات بەهای بێدەنگیمان لەلا ونە. کە باس لە بێدەنگی دەکەین باس لە دەرەوەی خۆمان دەکەین، هەرچی بەدەورمانەوەیە، شتەکانی ناوەوەمان بێدەنگ نین. بەم مانایە بێدەنگی دژ بە زۆرەبلێیی نییە، دەکرێ هەر کەسێك ناوەوەی پڕ لە قسە بێت، مێشکی بە وردە ئاخافتن جەنجاڵبێت، لە دەرەوەش نقەی لە خۆی بڕیبێ. ئەم وێنەیەش جودایە لەوەی کەسانێك لە ترسی تەنیایی قسەی زۆر دەکەن، حاڵەتی هاودژی بێدەنگییە لە ناو جەرگەی قسەکردندا.

بێدەنگی کۆمەڵێ هێما و نیشانەیە کە لە هەموو بارو دۆخێکدا سیمبولەکانی ئاشکرا دەبن. دەزانین کە لە نێوان قسەکردن و بێدەنگیدا هەناسەیەك هەیە. تاڵە مویەکە کە وشە و ڕستەیەکی داهاتوو دەیپچڕێ. بێدەنگی گشت ئەو دەنگانەشە کە بە شێوەیەکی دی دەریدەبڕین. کەسی کەڕولاڵ دەربڕینی خۆی هەیە، هاواری خۆیشی هەیە، سیستەمێك لە هێما و نیشانە دەربڕینەکانی دەنوێنن. بێدەنگی کەسێکی پیر لە کەسێکی گەنج جودایە، هی سۆفییەك و فەیلەسوفێك لە سیاسییەك زۆر دوورە، هی کچێك لە کوڕێك و هی منداڵێك لە گەورەیەك جودایە. بێگومان جیاوازی هەیە لە نێوان بێدەنگی و نەبوونی غەڵبەغەڵب، بەم مانایەش لە بێدەنگیدا پەیوەندی ونە "کۆمیونیکاسیۆن". ئەوەی بێدەنگی پێمانی دەبەخشێ بیرکردنەوەیە، ئەو چرکەساتانەیە کە مرۆڤ تێیاندا دەتوانێ بێشەرم شۆڕبێتەوە ناوەوەی خۆی و ڕوونتر خۆی و



شتەکان ببینێ. نەبوونی غەڵبەغەڵب تەنها حاڵەتێکی سەپێندراوە کە تیایدا ونبوونی هەراورویای ئەوانی ترمان لێ دوورە. بەهەمان ئەم واتایە بێدەنگی هەڵبژاردنیشە، ئەو ساتەیە کە بە ویستی خۆمان دەچینە ناوی و ئەویش دێتە ناومان و یەکتری تەواو دەکەین.
بێدەنگی دەیان فۆرمی هەیە. فۆرمێکی خود سانسۆریشە ئەگر بێتو وشەیەك یان کۆمەڵێ وشە لە دەوروبەری قەدەغەدا بسوڕێنەوە، یان برینداركردنی لەدوادا بێت، یاخود بۆهەرچ هۆیەکی سامناك نابێ دەریانبڕێ. لە هەندێ دۆخیشدا ڕۆشنایی‌یەکی زۆرە لە پلەی بیرکردنەوە کە بە نێوەندی بێدەنگی ڕێ لەڕوودانی کارەساتێك دەگرێ.
بێدەنگی هەڵوێستێکی گاندی و ماندێلامان دەهێنێتەوە یاد، فۆرمێکی ترە لە یاخیبوون، وەلێ فۆرمێکی گۆشەگیرە بەرامبەر بە زرمەی پۆستاڵ و تەقینەوە. ئەگەر بێدەنگی فیکرێکی ڕۆشنی لە دوادا بێت بەرهەمهێنەرە، دوورە لە تێکەڵوپێکەڵ، ئەگەر بە پێچەوانەش بێت ئەوە پڕە لە مارو ئەژدیها و هەرچی بیرۆکەکانە قوتی دەدەن. بێدەنگییەکی درۆ و ڕووکەشی جوادیە لەگەڵ بیدەنگی راستی، ئەوەی یەکەم دەستکردە، کەسێك خۆی وەها نیشان دەدات کە بیدەنگە، سەنگینە، وەلێ تا بڵێی پوچە و بەتاڵە؛ ئەوەی دووهەم لە ناوەوەی جەنگێکی کوشندە دەگێڕێ دژ بە خۆی پێش ئەوانی تر و خۆی ڕادەهێنێ لەسەر وەرگرتنی قسەکانی ئەویتر.
چرکەیەکی بیدەنگی ڕاستی قوڵ دەکرێ دەیان شتیش لەیەك کاتدا لەخۆی بگرێ. لە بێدەنگیدا چاوەڕوانی





هەیە. ساتەوەختی گەشتێکی نێو خەیاڵە و بیری لێدەکەینەوە چۆن ئەنجامیدەین. کە لە چرکەیەکدا بێدەنگین گوێمان گرتوە، چاوەڕێشین دواتر ئەوانی تر بێدەنگبن تاکو گوێمان بۆ بگرن. گەڕان بە دوای بێدەنگی دۆزێکی لوکسە، واتە کەمالیاتە کە دەست هەموو کەسێك ناکەوێ. بۆ ئەوەی بچیتە ناو بێدەنگی دەبێ خۆشت باوەشت بۆکردبێتەوە.

بێدەنگی دروستکردنی بینایەکە لە وشەی دەرنەبڕاو کە هزر لە پرۆسەیەکی بەرهەمهێناندایە، وشەکان لێرەن، دەزانین کە وا لە ژێر زارمانە کەچی دەریان نابڕین، بەو جۆرە، بیناکە لەئارادایە وەلێ هێشتا بەتاڵە. بەم وێنەیەش دەتوانین لە خەون تێبگەین، بێدەنگی نێو خەون وێنەی ئەو قسانەیە کە لە ڕۆژدا خەفەکراون.

هەندێجار بێدەنگی ئەو چرکەی نووسینەیە کە لە میترۆیەکدا تەنها بۆ ئەوەی لە ماڵەوە دوورکەومەوە و شتێك بنووسم لە نێو غەڵبەغەڵبی قسەکەرانی ناو میترۆکە دەگەمە ئەو ڕاستییەی ڕام لەسەری دەوستێ، بێدەنگی من نووسینە و لە قازانجی نووسیندایە لە کاتی غەڵبەغەڵبی ئەوانی دی، ونبوونی دەنگی ئەوانە لە نێوان کۆدی بێدەنگی من. بیدەنگی سۆفیانەیە کە دۆخی فرە خێرایی "ئیمرجنسی" خۆی دەسەپێنێ تاکو داهێنانێك بێتە ئاراوە و خود لەوێوە بتوانێ لەهەناوی بیدەنگییەوە لەدایکبێتەوە. دەتوانم بڵێم ئا ئەم چرکەیەیە کە وا ئەم دەقە کورتەی تێدا دەنووسم و ئەزموونی بێدەنگی تێدا دەکەم.

بێدەنگی کێشی قورسە گەربێتو بەهاوشانی ترس بێت، لە حاڵەتی پشوو و سەر سووکی و بیرکردنەوە تێدەپەڕێ و دەبێتە مایەی دڵەڕاوکە. لەهەمان کاتدا وەك لایەنی شەخسی خۆم، من لەو کەسانە دەترسم کە بێدەنگن، هەرگیز جێی متمانەم نین، لێیان دووردەکەومەوە، چونکو دەزانم لە پشت ئەو هێمنیە دەستکردە شتێکی قورس خۆی بۆم مەڵاسداوە. پێمخۆشە وەها بیرکەمەوە لە بێدەنگی کە چرکەیەکی خوێندنەوەشە، تەنها کەسایەتییەکانی نێو ڕۆمان و چیرۆکەکان دەدوێن و خۆم بە بێدەنگی گوێ لە ئاخافتنەکانیان دەگرم و پێیان نابڕم. خەونێکی کورتی پشوویەکی نێوان نۆتەی مۆسیقاشە، فرە کورتە، ئەو خەونەشە بە ڕووبارێکی بەخوڕ کە پێمانخۆشە لە بێدەنگی ئێمە ئەو ئاوازی خوڕەی بژەنێ.



# بێدەنگی وەك دۆخێكی ئەنتۆلۆجی

**ماردین ئیبراهیم**

بێدەنگی بۆ من زۆرتر دۆخێکی ئەنتۆلۆجییە نەك دۆخێكی فیزیكی، هەلومەرجێکی ناوەکییە نەك دەرەکی، پەیوەندی بە هارمۆنیای ناوەکی خۆمەوە هەیە، نەك باری بێجووڵەیی دەرەوەی خۆم. لە کاتێکدا کە دەرەوە هێمن و بێجووڵەیە، هیچ ژاوەژاوێك لە دەرەوە نییە، کۆڵان کشومات و بێدەنگە، نە خشەی گەڵایەك، نە دەنگی باران، نە وژەی با لە سروشتدا دەبیستریێت، ڕێك لەو کاتەدا دەکرێت لە ناوەوەی مندا ژاوەژاوێکی گوێ کاسکەر ببیسترێت، دەکرێت ڕێك لەو کاتەدا من ئازاری دنیا بچێژم بەدەست کەیۆس و دەنگەدەنگی ناوەکی خۆمەوە. پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە، چونکە زۆر جار لە دەرەوەم و لە ناو گڤەی با و ورەی ئوتومبێل و هارەی فیزیکی شتەکاندا دێم و دەچم و لەهەمان کاتدا لە ناوەوەمدا هارمۆنیا و بێدەنگی سەروەرە. لێرەوەیە من نووسین دەبەستمەوە بەو کاتانەوە کە لە ناوەوە خاوەن هارمۆنی و بێدەنگیم، هەر ئەو دۆخەشە وام لێدەکات من بتوانم لە ناو ژاوەژاو و دەنگەدەنگ و کەشوهەوای قەرەباڵخدا بتوانم بنووسم. تاکە ڕیتواڵێك بۆ نووسینی من تەنیا بوونی ئەو هارمۆنیا و بێدەنگییە ناوەکییە وەك پێشمەرج، بۆیە بەشێك لەو تێکستانەی نووسیومن



لە ناو قەرەباڵخی دەرەوە نووسیومن، یان لە شوێنی کارەکەم، یان لە کافێ شۆپەکان یان لە زانکۆ کە خەڵکێکی زۆر بە دەورمەوە بووە، بەڵام لە ناوەوەمدا بێدەنگی بەرقەرار بووە. بە دەیان جاریش لە ماڵەوە بە تەنیا بووم بەڵام قەرەباڵخی و دەنگەدەنگی ناوەوەم نەیهێشتووە بنووسم.
دیارە بوونی ئەو هارمۆنیا و بێدەنگییە ناوەکییە پێشمەرجە بۆ هەر کارێکی داهێنەرانە، بەڵام بەشێکی گرنگی مێژووی قسەکردنی مرۆڤ دەربارەی بێدەنگی، بەستنەوەی بێدەنگییە بە بێدەنگی و وەستاوی سروشت لە دۆخە فیزیکییەکەیدا؛ بەستنەوەی هارمۆنیای ناوەکییە بە سکون و ئارامی دەرەوەی مرۆڤ. بەڵام چەندە مرۆڤ سوور بووە لە دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان ئارامی ناوەکی و سکونی دەرەکی؛ لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی گرنگی پراکتیکی مرۆڤ جووڵە بووە بە ڕەوتێکی پێچەوانە. ئێستا ئێمە لەناو پڕ ژاوەژاوترین و جەنجاڵترین شارە میترۆپۆلەکاندا سۆفی و عارف و داهێنەر و مۆسیقار و ئەدیب و ئایینداری گەورە دەبینین، هەروەك چۆن لەناو دڵی سروشت و بێدەنگی دەرەوەی شارەکاندا تیرۆریست و کاراکتەری ترسناکی دژەژیان دەبینین کە بە دەست کەیۆس و شپرزەیی ناوەکییەوە دەناڵێنن.
لە دنیای ترادیسیۆنالدا سەرجەمی هەوڵی بەشەری لە ڕێگەی ئایین و ڕیتواڵەکانییەوە، لە ڕێگەی ڕێوڕەسمە ئایینییەکانییەوە، لە ڕێگەی نوێژ و یۆگا و خەڵوەتەکانییەوە، بۆ دۆزینەوە و جێخستنی ئەو هارمۆنیا ناوەکییەیە. دووای ئەوەی مرۆڤ دنیای ترادیسیۆنال جێدەهێڵێت و ڕینیسانس ڕێگا بۆ ڕۆشنگەری و دوواتریش مۆدێرنیتی خۆشدەکات جارێکی دی مرۆڤ هەوڵدەدات ئامرازگەل دابهێنێت و بدۆزێتەوە بۆ گەیشتن بە هارمۆنیای ناوەکی؛ بەڵام ئەمجارەیان بێگومان مرۆڤ پەنا بۆ تەکنیکی دیکە دەبات. میوزیکی کلاسیك، هونەری ڕینیسانس، داهێنانی سەردەمی ڕۆمانتیك و دوواتریش ئەدەب و هونەری دنیای مۆدێرن هەوڵگەلی مرۆڤن بۆ گەیشتن بەو سکون و بێدەنگییە ناوەکییە.
لای من بێدەنگی هێندەی ڕەهەندێکی ئۆنتۆلۆجی و ناوەکی هەیە، هێندە ڕەهەندێکی فیزیکی و دەرەکی نییە.



# تاریکی و خۆشاردنەوە لە "رووتبوونەوەی وشەکان"ی غەمگین بۆلی

**ئەحمەدی مەلا**

**"عەقڵ شتێکی چاکە، خەیاڵیش شتێکی چاکە"**
**پۆل کلۆدێل**

دەسپێك

ئەم لێکۆڵینەوانە کە لەمەڕ دەقی شیعریی دوای راپەڕین دەنووسرێت لە چوارچێوەی ئەو بۆچوون و تێگەیشتنە رەخنییە خۆی ناونووس دەکات کە پێی وایە "رەخنەی ئەدەبی لە هەمان کاتدا رەخنەیە لە بەرهەمێکی دیاریی کراوە و رەخنەشە لە خود. زانیارییە لەمەڕ ئەوی دیکەوە و بە نیسبەت خودیشەوە. وەکو ئەوەی کۆ-لەدایکبوونێکی نوێ بێت لە جیهاندا." رۆلان

پارت:١٩٦٤.)
دەقی شیعریی هەرگیز دەقێك نییە وەکو هەتاو خۆی ئاشکرا بکات، یا وەك حەبەلوول تەنها لە نهۆمە ژێرینەکانی خاکدا بژێت. شیعر ئەو دەرکەوتنەیە کە خۆی دەشارێتەوە، یا ئەو خۆشاردنەوەیە کە دەیەوێ سەرەتاتکێمان لەگەڵ بکات. رەنگە خەیاڵ پانتاییەکی روون لە دەقەکانی غەمگین بۆڵی داگیر بکات، نەك خەیاڵێکی خەلاق، بەڵکو خەیاڵ ئەو ئەسپەیە کە شاعیر دەیەوێ سواری بێت و هەڵبێت. بۆ کوێ؟ شاعیر خۆشی نازانێ! هەڵهاتن لای بۆڵی، واتە خۆشاردنەوە... لە پێناو دەقێکی دیکە کە گومانمان لە پەیدابوون و دایکبوونی نییە.
"رووتبوونەوەی وشەکان" لە هەمان کاتدا داماڵینی بەرگی یەکەمی وشەکانە، لە هەمان کاتیشدا نغرۆ بوونە، خۆ شاردنەوەیە لە نێو لۆچەکانی تاریکی، لە سێبەرگەرانە، ئالودەبوونە بە شەو، خۆ دزینەوەیە لە هەتاو و روونیی. ئەم خۆشاردنەوەیە خاوەن چەندین دەلالاتە، یەکێك لە دەلالاتە شیعرییەکانی ئەم خۆشاردنەوەیە، خۆ مەڵاسدانە بۆ ئەوەی سەر لە نوێ، لە ئانوساتێکی دیکەدا، لۆچەکانی تاریکی بە گوێزان ببڕێت و بێتەوە ژیان، بێتەوە نێو بوون، واتە نێو زمان.
لای نەوەی دوای راپەڕین، شتێك هەیە لە نێوان پۆرنۆ و رۆمانسییەت و ئیرۆتیك. رەنگە هێشتا بە تەواویی ئەم چەمکانە لە لای ئەم نەوەیە سەقامگیر نەبووبێت، یا هەندێجار لە دەربڕینە هەمەچەشنەکانیاندا لە سنووری یەکتر دەخشێن. ئەم پەرادۆکسە لە لای بۆڵی خۆیمان بۆ ئاشکرا دەکات، "رووتبوونەوەی وشە" لە پاڵ " وشەکان خەریکی سێکسی خەیاڵن: لا ٧" هاوتەریب دەوەستن.
بۆ ئەوەی ئەم چەمکی ئێرۆتیك لە جیهانبینی شیعرییدا چەکەرە بکات مەرج نییە باس لە جەستەی نێر و مێ بکرێت، بەڵکو لە ئەنجامی وروژاندنی سەرجەم رەگەزە شیعرییەکاندا دێتە دی و بەرجەستە دەبێت، لە خەوهەڵساندنی شتە خەوتووەکاندا دێتە دی. ئارەزووی زیهنی و شەهوانی بهێنێتە جۆشوخرۆش و دووفاقانە بانگەشەمان بکات ؛ لەززەتێك بۆ زیهن و لەززەتێکی شەهوانی. کەچی پۆرنۆ، گرینگیدانە بە جووتبوون و ئاشکراکردنی هەموو تابووەکان، وەلاوە خستنی چەمکی ئێستێتیکایە، رەنگە هەندەی بیەوێت شەهوەتەکانی جەستە بهێنێتە زمان، هەندە لە سەر ئارەزووەکانی زمان ئیش نەکات، هەندە تابووە کۆ مە ڵا یە تییە کا ن بهێنێتە زمان، هەندە ئامانجی شیعرییەت

نەکاتە مەبەستی خۆی. بەڵام رۆمانسییەت ترازاندنی لغاوی خەیاڵە، بەرەڵاکردنی وزەی ئەندێشەیە بۆ ئەوەی لە هەوارە دوورە دەستەکان، دەست بەسەر شتە چەپککراوەکاندا بگرێت. ئارەزووی پێکگەیشتنێکی مەحاڵ دەوروژێنێ. یاری لە گەڵ بەربەستە وجوودییەکان دەکات : مەرگ دەبێتە داینەمۆی ئەم ورووژاندنە. لە هەموو بارێکیشدا، هەر چەمك و بە جۆرێك ئیش لە گەڵ خەیاڵ دەکات و ئیش بە خەیاڵ دەکات.



رەهەندەکانی تاریکی لە "رووتبوونەوەی وشەکان"

سەفەری غەمگین بۆڵی، سەفەرێکی پەنهانە، رەنگە لە ناواخنیشدا گەمەیەك بێت، بەڵام گەمەیەکی ئازارویە، دەیەوێت لە واقیع هەڵبێت بۆ ئەوەی لە نێو وشەکان جێی خۆی بکاتەوە؛ وشەکانیش رووتدەبنەوە، لە دوو تۆی ئەم رووتبوونەوەیەدا، شاعیر هەوڵی خۆشاردنەوە دەدا... خۆشاردنەوە لە دونیا لە پێناو لە دایکبوونەوەیەکی دی، هی شاعیر نا، بەڵکو هی خودی شیعر.

شیعری غەمگین بۆڵی دەچێتە نێو تاریکییەوە، لە سێبەرەکان لە دایکدەبن و دەچنە ناوچە تاریکەکان:

" دەرگەکان قفڵ دەدەم"
"پەنجەرەکان دادەخەم"
"پەردەکان دادەمەوە"
"گڵۆپەکان دەکوژێنمەوە"
"دەمەوێت باسی خۆکوشتن بکەم. لا ٨"

لە راستیدا، مەرگ و خۆکۆشتن و راکردن لە ژیان سیما هەرە لە بەرچاوەکانی شیعری دوای راپەڕینە. ئەم سیمایانەن کە تەزوویەکی رۆمانسیانە دەبەخشنە ئەم جۆرە شیعرە. رۆمانسییەکی نوێیە، چونکە خاوەنەکانیان خۆیان بە رۆمانسی نادەنە قەڵەم، بەڵام خەیاڵێکی رۆمانسییانە ملی دەقەکانیان دەگرێ. رۆمانسین بە بێ ئەوەی بیانەوێت...بەربەستە کۆمەڵایەتییەکانن بەرگی رۆمانسییەت دەدەنە ئەم دەقانە.

بانگەشەکردنی شەو وەکو چارەسەرێك، خەونی زۆرینەی شاعیرانی حوجرەش (ئێمە پێشنیاری تێرمی "شاعیرانی حوجرە" لە جیاتی شاعیران کلاسیك دەکەین) بووە. بۆڵی دێت بە

زمانێکی نوێ باسی لێوە دەکات : " نیوە شەوان، بە شووشەی پەنجەرەی ژوورەکەمەوە، دەنووسێت."
بۆچی شاعیر پێویستی بەم هەموو تاریکاییە هەیە؟ لە نێو شەو و تاریکییدا، شاعیر دەیەوێت دەست بەسەر شتەکاندا بگرێت، بەڵکو یەخسیریان بکات، بیانکاتە زیندانەوە، تەنانەت بیانکاتە بەشێك لە خودی خۆی. ئەم دەست بەسەرگرتنە، جۆرە هەوڵ و تەلاشێکە بۆ ئەوەی "وشە" وەکو هەوێن بەکاربهێنێت، بۆ ئەوەی بچێتە پرۆسەیەکی ئەلشیمییەوە، واتە بیکاتە بۆتەیەکی لابۆرەوە تا شتێکی دیکەی لێدروست کات. شاعیر کیمازانێکە، بەڵام ئەم پرۆسەیە لە ناوهۆشیاریی شاعیردا روو دەدات، ئەو لە ناخی خۆی گومانێکی زۆری هەیە کە ئەم وشانە لەم حاڵەتە گەیشتبێتە ئەوجی کامڵبوون و بە شیعربوون، بۆیە دەیەوێ لە نێو لۆچی تاریکیی خۆی بشارێتەوە. شاعیر وەکو نارازییەك خۆیمان پێ دەناسێنێ : نارەزا لە واقیع، نارەزا لە شیعر، نارەزا لە خودی خۆی.
بۆیە دەڵێ : :دەترسم تاریکی کتێبەکانم بخاتە توورەکە رەشەکەیەوە...لا١٢"

غەمگین لە فەرادەتی شیعری دەگەڕێ، بەڵام ئاسان نییە، چونکە رووناکی هەیە، واتە سەرجەم نووسراوەکانی دی، دێن و لە سەر مێشکی، لە ناو هزری خۆیان ئاشکرا دەکەن. رووناکی واتە سێبەر، یا روونتر، سێبەر روویەکی دیکەی رووناکییە. ئەو لەم هاوکێشەیە هەڵدێت، یا دەیەوێت هەڵبێت :
"گڵۆپەکان دەکوژێنمەوە
خۆم لە تاریکییدا ون دەکەم
تاقەتم نییە،
سێبەرەکەم لاساییم بکاتەوە. لا ١٥"

ئەو دەیەوێ لە دووپاتبوونەوە، لە لاساییکردنەوە هەڵبێت، دەیەوێ تاك بێت، هەوڵی ئەم تاکبوونەیە بانگاشەی دەکات بۆ نێو تاریکی. لە تاریکییدا هەموو بەرزیی و نزمییەکان، هەموو وردەکارییەکان دەسڕێنەوە، خەوش و دزێوییەکان دێنە یەك ئاست، یەك شت دەمێنێتەوە : تاریکی وبەس. شاعیر ئەو کائینەیە کە هەمیشە دەیەوێ لە دایکبێتەوە. بۆیە شوێنی تاریکی بۆ ئەو، وەکو تابووت وایە، وەکو ناوسکی زەمین وایە، وەکو ئەشکەوتە، خەڵوەتێکە لە پێناو هەڵسانەوە و هاتنەوەزمان و قسەکردن و نووسین.
"بمخەنە قۆدییەك، جوانترین "لا ١٦"

گوزارشتی ئەم خەڵوەتەیە. قووتی بچووکترین شوێن بە گەورەترین کائین کە شاعیرە. ئایا هێچ ئاماژەیەك بەدی ناکەین بۆ فانۆسە سیحرییەکەی عەلادین؟
ئەم خەڵوەتە شیعرییە، لە پێناو لە دایکبوونەوەی شیعرێکی دیکەیە کە هێشتا نەنووسراوە، هەر بۆیە "وشەکان رووت دەبنەوە". رووتبوونەوە لە هەمان کاتدا مەرگ و لە دایکبوونەیەوە. ئەم هەوڵی لە دایکبوونەوەیە زۆر بە وردی لەم چەند دێڕەدا دەردەکەون :
"تازە رووناکی درەنگی کردووە
دەبێت لە تاریکیدا،
ئەم داوە بخەینە کونی دەرزییەوە! لا ٢٠"
غەمگین بۆڵی لەو خەڵوەتەوە سەیری ئایندە دەکات، ئایندەی وەکو چەمکێکی ئەپستراکت نا، بەڵکو مەبەست لە ئایندەی شیعرەکانێتی، خەون دەبینێ، لە "قۆدی" رزگاری بێت و " ژوورەکان بە قەت خەیاڵ فراوان و
حەوشەکەی بە قەت وشەکان پان بن.لا٢٨"
ئەم حاڵەتە ئینسانییە قووڵە، حاڵەتێکی شیعریی تەندروستیشە. شاعیر لە شیعر دەگەڕێت ؛ لە راستیدا، لە هیچ شتێك ناگەڕێت کە لە دەرەوەی خۆی بێت، رەنگە هەر لە خودی خۆی بگەڕێت، لە دەنگی تایبەتی خۆی بگەڕێت. بۆڵی لە کۆتاییدا خۆی ونکردووە. ئەم حالەتە سایکلۆژییە زۆر گرینگە، جۆرە شیکارێکی دەروونییە، جۆرە هەڵاتنێکە لە خود بۆ دۆزینەوە خود. شاعیر سەیری دەقەکانی دەکات وەك چۆن سەیری ئادگار و سیما و خەتەکانی روخساری خۆی دەکات. بەڵام ئەفسووس! شتێك هەیە هێشتا کامڵ نەبووە، شتێك هەیە لە ژێر دەستی شاعیر خۆی رادەپسکێنێ. دەزانێ یا نا! بەڵام بە تەواویی گومان دەکات : " رەنگە هیچیش نەبێ هەر من بم بە دوای خۆم! لا ٣٩"
واتە ئەم شەڕە، لە هەمان کاتدا شیعرییە، لە هەمان کاتیشدا وجوودییە، یەك شت بۆ شاعیر ئاشکرا دەبێت : شاعیر لەم هەوڵ و تەقەللایەدا تەنها بە دوای سەرابدا وێڵە. دەڕوات و هەنگاو دەنێت و پێشدەکەوێت، کەچی هیچیش دیارنییە :

"سەیرە!
زۆر زۆر سەیرە!
لە ئاوێنەشەوە،
خۆم بۆ نادۆزرێتەوە!؟ لا٤٤
لە راستیدا، غەمین لە روخساری فیزیکی خۆی ناگەڕێت، بەڵکو لە روخساری ناوەکی، لە سیما پەنهانەکانی شیعر دەگەڕێت، بۆیە سەیر دەکات و هیچ نابینێ.
ئەم چەقبەستانە، ئەم وەستانە، ئەم مەنگییە خەیاڵ دەبەخشێتە شاعیر بۆ ئەوەی هەڵبێت، رابکات و لەم حالەتە دوورکەوێتەوە. بەڵام ئایا خەیاڵ فریای دەکەوێت ؟

"شەوێ بە بێ قاچەکانم سەفەرم کرد!" لا ٤٨
خەڵوەت، تاریکی، پرسیار، گومان...سەرجەم ئەم رەگەزانە گرینگن لە شیعریی ئەودا. شتێك هەیە پێی دەڵێن واقیع کە بانگاشەی دەکات و هێمنی و گۆمی تاریکیی پەیڤەکانی دەشڵەقێنێ. هەمیشە واقیع شیعرەکانمان لێ تێکدەدات، وەك ئەو منداڵە شەڕانییەی لە پڕێکدا دێت و گەمەکان تێکدەدات :
"بەم نیوە شەوە...
دەنگی گولـلەیەك،
ژوورەکەمی پڕکرد لە گومان؟!" لا ٥٨

لە نێوان خەڵوەت و واقیعدا شتێك دەجووڵێ. ئارامیی تێکدەدات. ئایا ئەمە دەرکەوتنی دەقێکی نوێیە، یا ئاسۆی دەقێکی نوێیە؟

" تارماییەك :
لە دوو بۆشاییدا دەجووڵێ!" لا ٨٢
شاعیر لە سەرەتادایە، بەڵام سەرەتایەکی گرینگە، چونکە خۆی نادات بە دەستەوە. لە لاساییکردنەوە هەڵدێت و گوێ بۆ دەنگێکی دیکە قولاغ دەکات، بەڵام هێشتا ئەو دەنگە دیار نییە. "گولـلەیەك" دونیا دەشلەقێنێ بەڵام بە تەواوی نازانێت سیماکانی دەرەوە چۆنن؟ شاعیر لە نێوان تەنیایی و خەڵوەت و سێبەر و تاریکیدا "وشەکانی رووت دەکاتەوە" نازانێ چییان لێبکات، چییان لێ دروستکات. رووتبوونەوەیە بۆ پێکگەیشتن، یا بۆ داماڵینی سەرجەم واتا سواوەکان؟
بەڵام لە کۆتاییدا پێمان دەڵێ :
"نازانم دونیا چۆنە؟
بۆچی لێرەم؟
ئێرە کوێیە؟ لا ١٢١

ئەنجام
دەبێ شیعری
دوای راپەڕین
لە نێو
ها و کێشە ی
شارستانییەت

بخوێندرێتەوە. نەك ئەو شارستانیەتەی کە دروستبووە، بەڵکو ئەو شارستانییەتەی کە بە تەمای دروستکردنین. لەم بوارە شیعر کاشفێکی راستەقینەیە، بە شێوەیەکی زۆر ورد، ئەگر هەموو نەنگیی و خەوشەکانی ئەم شارستانییەتەمان بۆ دەستنیشانیش نەکات، ئەوە ئاماژەکانی دەبێ بە گرینگ وەرگیرێن.

باس لەو بەر بەرستە وجوودییانە دەکات کە رێگرن لەوەی دەقی شیعریی دروست بێت، ئەو دەمامکانە ئاشکرا دەکات کە روخسارەکان دادەپۆشن، هەروەها باس لەو جەنجاڵییە دەکات کە ئاودیوی باری سایکلۆژی بکەرەکان دەبێت.

شیعری مەزن، هەر وەك رونێ شار دەیوت یا لە سەرەتای شارستانییەتەکانەوە لە دایکدەبن، یا لە کۆتایی شارستانییەتەکانەوە.

شیعری کوردی دوای راپەڕین سەرمایەیەکی لە بننەهاتووە بۆ ئەوەی ژیانمان بۆ کەشف کات، ئەو ژیانەی کە بە پێشچاوماندا تێدەپەڕێت و نایبینین.

غەمگین بۆڵی، گەمەیەك دەکات لە سەر سنووری شتەکان گەمەکانیمان بۆ روون دەکاتەوە. لە نێوان "رووتبوونەوە" و "خۆشاردنەوە"، واقیعی دژوارمان بۆ رووتدەکاتەوە. ئەو واقیعەی کە تەنها بە شیعر چارەسەر ناکرێت. ئەو بە باشی دەزانێ کە سەر لە هیچ دەرناکات!

ژێدەر :


رووتبوونەوەی وشەکان، غەمگین بۆلی، هەولێر، ٢٠١٢.

رۆلان پارت، لێکۆڵینەوەی رەخنەیی، دەزگای سۆی، ١٩٦٤، پاریس. لا ٢٦٣.

پۆل کلۆدێل، بیرکردنەوە لە شیعر، فۆلیۆ، ١٩٦٣، پاریس. لا ١٧٠.



# فێستیڤاڵی سینەمایی ڤینیسیا

## ئاودێر کاکەی فەلاح

فێستیڤاڵی سینەمایی لە شاری ڤینیسیای ئیتالی، کە لەساڵی ١٩٣٢ وەوە وا ئەمساڵ بۆ حەفتاهەمین جارە سازدەکرێت، کۆنترین فێستیڤاڵی تایبەت بە هونەری سینەمایە لە جیهاندا. ئەم بۆنەیە، لە پاڵ فێستیڤاڵی کان و فێستیڤاڵی بەرلیندا، بە یەکێك لە سێ گرنگترین فێستیڤاڵی فیلم لە

جیهاندا دادەنرێت.
ئەم بۆنە سینەماییە، کە ساڵانە لە کۆتایی مانگی ئەوگوستدا بۆ ماوەی پانزدە ڕۆژ بەڕێوەدەچێت، زۆر لە فیلمسازان و سینەماکاران بە خۆشییەوە ڕووی تێدەکەن. ئەستێرە ناودارەکانی سینەما، نەك تەنها لەبەر گرنگی فێستیڤاڵەکە بۆ ئێرە دێن، بەڵکو لەبەر جوانی و تایبەتمەندیەتی شارەکەش، تاکو خۆیان و فیلمەکانیان بە جوانترین و نموونەییترین شێوە پێشانی دونیا بدەن.
لیژنەی داوەری پێشبڕکێی سەرەکی ئەمساڵ، بەسەرۆکایەتی دەرهێنەری ناوداری ئیتالی "بێرناردۆ بێرتۆلوچی" بوو. ئەم دەرهێنەرە بەم ساڵەوە تا ئێستا سێ جار سەرۆکی لیژنەیەکی لەم جۆرە بووە. هەردوو جاری پێشووی، بڕیاری پێدانی خەڵاتی یەکەم بەسەر ئەو فیلمانەدا بووە، کە بەڕای زۆرینەی ڕەخنەگران و ئامادەبووان، چاوەڕوانی خەڵات وەرگرتنیان لێنەکراوە. ڤینیسیا بۆ ئەم دەرهێنەرە هەمیشە پلاتفۆرمێکی باش و گونجاو بووە. ئەم فێستیڤاڵە لە جیهاندا بەوە ناودارە، کە هەمیشە جێی پێشاندانی فیلمە ئازا و چاونەترسەکان بووە. ئەو فیلمانەی کە دژ بە شەپۆلە باوەکانی سینەما مەلە دەکەن و لەگەڵ زەوقی زۆرینەی بینەراندا خۆیان ناگونجێنن.
فێستیڤاڵەکە بە فیلمێکی ئەمریکی کرایەوە، کە نوێترین کاری دەرهێنەری مەکسیکی "ئەلفۆنسۆ کوارۆن"ـە و لە دەرەوەی پێشبڕکێی سەرەکیدا پێشاندرا. ئەم فیلمە درامییە هەرچەندە فیلمێکی هۆلیوودییە، بەڵام بە چیرۆکە سەیر و تاڕادەیەك غەمگینەکەیەوە، بەڕای زۆر لە ڕەخنەگران بۆ کردنەوەی فێستیڤاڵێکی وا شیاو نەبوو. سەرۆکی لیژنەی داوەری بێرتۆلوچی لە ڕۆژی یەکەمی فێستیڤاڵدا وتی: خەڵاتی یەکەم دەدەین بە فیلمێك، کە تووشی سەرسوڕمانمان بکات و پێچەوانەی چاوەڕوانێکانمان بێت.
هەر بەو پێیە خەڵاتی "شێری ئاڵتونی" ئەمساڵ بە فیلمێکی دۆکومێنتاری ئیتالی درا.

**Sacro GRA**

واتە گرای پیرۆز، "گرا: بە ئیتالی کورتکراوەی ناوی ئەوتۆبانێکە، کە دەوری شاری ڕۆمای داوە"، لە دەرهێنانی فیلمسازی ئیتاڵی "جیانفرانکۆ رۆسی"یە. ئەم فیلمە یەکەم فیلمی ئیتالییە لەم پانزدە ساڵەی دووایدا خەڵاتی یەکەم بباتەوە. بە هەڵبژاردنی ئەم فیلمە بۆ ئەو خەڵاتە، بەڵێنەکەی بێرتۆلوچی هاتەدی، چونکە یەکەم جارە لە مێژووی ئەم فێستیڤاڵەدا فیلمێکی دۆکومێنتاری ئەم خەڵاتە بباتەوە، ئەوەی سەیرە ئەمساڵ یەکەم جاریشە فیلمی دۆکومێنتاری لە ڕیزی فیلمەکانی





پێشبڕکێی سەرەکیدا وەربگیرێت.
دەرهێنەر لە فیلمەکەیدا بە کامێرا بۆ ماوەی دوو ساڵ هاوەڵایەتی کارەکتەرە ڕاستەقینەییەکانی فیلمەکەی کردووە.
فیلمەکەی باسی چەند مرۆڤێك دەکات، کە ژیانیان بە شێوەیەك لە شێوەکان بەم ئەوتۆبانەوە بەستراوەتەوە.
پێشاندان و ڕێزلێنانی فیلمی دۆکومێنتاری لە فێستیڤاڵێکی وادا، جۆرێکە لە دان پیانان بە گرنگی ئەم جۆرە فیلمانە. ئەو سەرکەوتنە چاوەڕوان نەکراوە گەورەیەی کە دەرهێنەری ئەمریکی "مایکڵ موور" و فیلەکەی **Bowling for Columbine**

لە ساڵی ٢٠٠٢ دا بەدەستیان هێنا، بوژانەوەیەکی گەورەیان بەسەر ئەم جۆرە هونەرە سینەماییەدا هێنا. ئەم فیلمە وای لە سەدان فیلمی دۆکومێنتاری تر کرد، کە لەمەودوا وا شەرمن نەبن و ڕویان بێت خۆیان بە هۆڵەکانی سینەمادا بکەن.
لوتکەی سەرکەوتنی ئەم بوژانەوەیە فیلمی **Fahrenheit 9/11**ی هەمان دەرهێنەر بوو، کە ساڵی ٢٠٠٤ خەڵاتی یەکەمی فێستیڤاڵی "کان"ی بردەوە. ئەم فیلمە، کە باسی شەڕی عیراق دەکات، لە ڕووی داهاتەوە سەرکەوتوترین فیلمی دۆکومێنتارییە لە مێژوودا.
لە فێستیڤاڵی ئەمساڵدا فیلمێکی دۆکومێنتاری تریش لە پێشبڕکێی سەرەکیدا وەرگیرابوو، کە بە هەمان شێوەی فیلمەکەی "موور"، باس لە شەڕی عیراق دەکات و پۆرتەرێتی وەزیری بەرگری پێشووی ئەمریکی "دۆناڵد ڕامسفێلد"ـە. ئەم فیلمەی دەرهێنەری ئەمریکی "ئێرۆل مۆریس" کە بە ناوی **The Unknown Known**

بە ڕای زۆر لە ڕەخنەگران لە فیلمە ئیتالییەکە سەرنجڕاکێش تر بوو، بەڵام بە داخەوە هیچ خەڵاتێکی پێنەدرا.
نەك تەنها ئەم فیلمە، بەڵکو فێستیڤاڵەکە چەندین فیلمی نایابی تری تیادابوو، کە زیاتر شایەنی "شێری ئاڵتونی" یەکە بوون. یەکێك لەو فیلمانە فیلمی **Philomena** ی دەرهێنەری بەریتانی "ستیڤن فرییەرز" بوو. ئەم فیلمە بەڕای زۆربەی ڕەخنەگران باشترین فیلمی فێستیڤاڵەکە بوو، کە لە کۆتاییدا تەنها خەڵاتی باشترین سیناریۆی پێدرا.

هەروەها فیلمی **Parkland** ی دەرهێنەری ئەمریکی "پێتەر لاندسمان". ئەم فیلمە باسی کوشتنەکەی سەرۆکی ئەمریکی "ج . ف . کەنەدی" دەکات، بەڵام ئەم جارە ئەو ڕووداوە تراژیدیایە لە نیگای چەند کارەکتەرێکی ئاساییەوە دەگێڕێتەوە، کە بە ڕێکەوت لەو ڕۆژە و لەو جێگەیەدا ئامادە بوون.

لە دوای تەواوبوونی هەندێك لەم فیلمانە، لە هۆڵی سینەماکەدا نزیکەی بیست خولەك چەپڵە بۆ فیلم و فیلمسازەکان لێدراوە. هەڵبەتە لە سەرێکەوە هەندێك کەس ئەم کارە بە زیادەڕۆیی لە قەڵم دەدەن. بەڵام لە سەرێکی ترەوە، ئەم فێستیڤاڵانە بۆ فیلمسازەکان تەنها دەرفەتن، تاکو ببینن لە شوێنێکی وا فەنتازیدا، فیلمەکانیان بەو شێوەیە گرنگی پێبدرێت و ستایش بکرێن. ئەم فێستیڤاڵانە وەك پەرستگایەك بۆ فیلم وان، کە ناوبەناو فیلمسازان و فیلمدۆستان ڕوویتێدەکەن و بە سرووتە تایبەتیەکانی ئەم دونیایە هەڵدەسن.

لە جیهانێکی ئێستای پڕ لە توندوتیژی و گیروگرفتە کۆمەڵایەتی و کێشە ئابوورییەکاندا، تاڕادەیەك جێی سەرسوڕمانە، چۆن ئەم بۆنانە تائێستاش هەر ماون و توانای ڕاکێشانیان لە دەست نەداوە! بەڵام لە سەرێکی ترەوە ئەم فێستیڤاڵانە بەشێوەیەك خۆیان لەگەڵ هونەری سینەمادا گونجاندووە، کە هەروا بەئاسانی لەیەك ناکرێنەوە. ئێستا نەك تەنها بوونیان بە بوونی سینەماوە بەستراوە، بەڵکو یەکێك لە فەرمانە سەرەکییەکانی ئەم هونەرەشیان بۆ خۆیان بردووە، بەوەی واقیع دەکەن بە فەنتازیا و لە هەمان کاتیشدا، فەنتازیا دەکەنەوە بە واقیعێکی بینراو.
دووایش لە هۆڵێکدا بە کۆمەڵ چەپڵەی بۆ لێدەدەن.

سێپتەمبەری ٢٠١٣



جولیۆس ج.ێپستاین-فیلیپ گ.ێپستاین-هاورد کۆخ

# کازابلانکا

## (فیلمنامە)

لە ئینگلیزییەوە

**کاوە کیانی**

جولیۆس ج.ێپستاین-فیلیپ گ.ێپستاین-هاورد کۆخ

کازابلانکا

کاوە کیانی

(کازابلانکا) یەکێکە لە ناودارترین فیلمەکانی دونیای سینەما، کە ساڵی 1942 لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەرهەم هاتووە.

ئەم کارە باس لە کۆچی بە کۆمەڵی ژمارەیەک هاووڵاتیی ئەورووپی دەکات، کە لە ترسی ئاگری جەنگ بە کەناری بەندەری (کازابلانکا)دا لە مەراکش دەیانەوێت بەرەو ئەمریکای ئارام بڕۆن...

لەوێوە چیرۆکی ئاشقانەی ڕیک بیلین (هامفێری بوگارت) و ئەلیسا لاند (ئینگرید بێرگمان) دەست پێدەکات.

ئەم فیلمە چەندین خەڵاتی گەورەی جیهانیی بەدەست هێناوە، لەوانە سێ خەڵاتی (ئۆسکار)، کە یەکێکیان بەخشرا بە سیناریۆی کارەکە.


**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**2013**




پێر لاگەر کڤیست

# کوڵەبنە

لە سویدییەوە
عەلی عوسمان یاقووب

پێر لاگەر کڤیست   کوڵەبنە   عەلی عوسمان یاقووب

"لاگەرکڤیست" لە ساڵەکانی جەنگی جیهانی دووەمدا خەریکی نووسینی ڕۆمانە گەورەکەی "کوڵەبنە" بوو تا لە ساڵی 1944دا بڵاو بووەوە. ڕۆمانەکە سەرکەوتنێکی گەورە بوو، چونکە لەسەر ئاستی جیهاندا دەنگی دایەوە. دیارە لە ڕواڵەتدا، ڕۆمانێکی مێژوویيە و ڕووداوەکانی دەرباری میرێکی سەردەمی ڕێنیسانس بەڕێوە دەچێت، میرێك، کە بیرکردنەوەیەکی ماکیاڤیلیانە دەیبزوێنێت و کارەکتەری سەرەکیش کورتەباڵەکەی دەربارەکەیەتی.
ڕۆمانی "کوڵەبنە" لە باری تەکنیکەوە لە شێوەی یاداشتدا نووسراوە و دەچێتە خانەی ئەو جۆرە ڕۆمانانەی، کە لە دونیای ئەدەبدا بە Epistolary novel ناسراون. لەم جۆرە ڕۆمانەدا، کە لە سەدەی حەڤدە و هەژدەهەمدا زۆر باو بوون، نەخشە و پلانی ڕۆمانەکە لە ڕێگای نامە یان یاداشتنامەی کارەکتەرێك یان چەند کارەکتەرێکەوە بەرەو پێش دەچێت.

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
2013





# هەندێ هونەری ڕەوانبێژی دەگمەن لەلای (نالی)

د.دانا ئەحمەد مستەفا

لە مێژووی ئەدەبی هەر گەلێکدا، ئەستێرەیەك یان چەند ئەستێرەیەك دەبنە پێشڕەو و ئاڵا بەدەستی ئەو گەلە و بنچینە و بنەواشەی ئەدەبی ئەو میللەتە لەوانەوە سەرپێی خۆی دەکەوێ، لە ئەدەبی عەرەبیدا ئبنو تەییبی موتەنەبی و لەئەدبی فارسیشدا شیرازی و لەئەدبی ئەڵمانیشدا گوتیە و لە ئەدەبی ئنگلیزیشدا شکسپیر و.. لەئەدبی کوردیشدا نالی، کە لەراستیدا گەشاوەترین ئەستێرەی ئاسمانی ئەدەبی کوردیە. بێگومان ئەوەی وای لە ڕەخنەگران و لێکۆڵەرانی بواری ئەدەب و ڕەخنە کردوە کەبەم شێوەیە پەسنی بکەن، تەنها سەلیقەی شیعریی ئەم کەڵە شاعیرەیە، کە خاوەن خەیاڵێکی بەرزە فرِ و کەم وێنەیە.. و تێگەیشتن لە شیعری نالی و قوڵبوونەوە لە بەحری

غەزەلی و دەرهێنانی دوڕ و گەوهەر دەریاگەردی چاك و لێهاتووی دەوێ، ئەوەتانێ خۆی دەڵێت:

بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە، ئەمما
غەوواصی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە

پڕ دانەیە، ئەمما نەوەکوو دانەیی چەڵتووك
بە حر م
وتووە، نەوەکوو گۆلی مەرەزانە(1)

کەواتە دەریای بێ بنی غەزەلەکانی پڕییەتی لەدوڕ و گەوهەری گرانبەهای واتای ورد و جوان، بەڵام وەنەبێ هەر کۆلکە مەلەوانێ بتوانێ بەئاسانی ئەو دوڕ و گەوهەرانە دەربێنێ و ئەو واتا بەرزانە لێکبداتەوە. بەڵکو دەریاگەردی وای دەوێ کە بزانێ قوڵ بۆی داچێ و بتوانێ بچێتە بنی دەریاکەوە و لەشیعرەکانی وردبێتەوە و تێیان بگات.. دەریای غەزەلەکانی نالی پڕە لەدانەی گەوهەر و دوڕی نایاب و مرواری گرانبەها، نەك دانەی چەڵتووك کەنیوەی پووش و نیوەکەی تری برنجە..

بەرزی ئاستی هۆنراوەکانی وایکردوە کەلەلایەن شاعیرانی ترەوە بکرێت بە پێوەری ئاستی شیعرییان وەکو حاجی قادری کۆیی کە (شیعری خۆی بەخەزەف دەدا لەقەڵەم لە ئاست گەوهەری شیعری نالیدا) (2) ، ئەوەش، بێگومان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چنینی وێنە لای نالی خاوەن کەرەسەیەکی دەوڵەمەندە.

لێرەوە دەبێت دان بەو راستییەدا بنێین کە: ئەو کەسەی بیەوێ خۆی لە قەرەی شیعرەکانی نالی بدات دەبێ ئاگادارییەکی تەواوی لەزانستە ئاینییەکانی وەك (مەعانی و بەیان و بەدیع و مەنتیق و عیلمی کەلام و فیە و ئوصولی فیقە نەحو و صەرفدا) هەبێت، چونکە لە شیعرەکانی ئەم زاتەدا چەندین زاراوەی ئەو زانستانەی کردۆتە بناغەی داڕشتنی وێنەکان.. زۆر بەکەمی بەیتێکی نالی دەبینین دوو دیوی نەبێت، یەکێکیان ئاشکرا و ئەوی دیکەیان نادیار:

نەزمی نالی میسلی ئاو و ئاوێنە رەنگی نییە
دوو رووە بۆ سەیری خاتر: یەك خەفی و یەك ئاشکار(3)

کەواتە شیعری نالی وەك ئاو



و ئاوێنە ڕەنگی نییە، دوو ڕووە، واتە بەر و پشتی هەیە. ڕووی یەکەم ئەوەیە کە ئادەمیزاد خۆی تیا ئەبینێ و واتای ئاشکرای بۆ دەرئەکەوێ. ڕووەکەی تری وەك بنی جام یان وەك جیوەی پشتی ئاوێنە وایە هیچ دەرناکەوێ.
ئەم کەڵە شاعیرە فەرهەنگی وشەی کوردی تەی کردوە و زۆربەی پەیوەندییە ستاتیکییەکانی نێوانیانی چنیوەتەوە و لەداهێنانی کەم وێنەدا ڕووخساری شیعرەکانی پێ نەخشاندنووە کە هەندێکیان دیارن و ئاشکران و هەندێکی تریان بەئاسانی هەستیان پێناکرێت، بەڵام کەکاتێ هەستی پێدەکرێ ڕەنگە مرۆڤ بگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەمە جۆرێك بێت لە جادوو چونکە بەدەرە لەتوانستی مرۆڤ، لەڕاستیدا توانای داهێنانی ناڵی بەردەوام چۆکی بەزمان داداوە و چۆنی ویستبێت بەباڵای بیردا بەرگی هونەری بڕیوە.. چەندی تریش بڵێین لەسەر نالی هەرکەمە و مامۆستا مەسعود محەمەد دەڵێت: "جا لەم بوارە گرنگەی هۆنراوەی نالیدا هەرچەندە هەوڵ بدرێت هێشتا لەسەرەتای ئەو ڕێگە سەخت و پڕ هەڵدێر و تەلیسماوییەداین کە شاعیر گرتوویەتە بەر"(**4**). بۆیە بەردەوام واتای نوێ لە وشەکانییەوە دەردەکەون، هەر سەرەداوی واتایەك دەدۆزینەوە لەڕێگەیەوە پەی بە دەیان واتای تر دەبەین، هەر ئەمەشە وا لە مامۆستا هێمنی شاعیر دەکات بڵێت: "خۆزگە هەموو ماڵە کوردێك دیوانی نالی لەژێر قورئانی پیرۆزدا دانابایە"(**5**).

یەکەم: درکە
لەفەرهەنگی زمانەوانیدا بەواتای (دانپیانان) دێت(**1**)، لەزاراوەی ڕەوانبێژیشدا "ئەوەیە کە قسەکەر بیەوێ مانایەك بگەیەنێ بە وشەگەلێك کەبۆ ئەو واتایە دانەنراوە، بەڵکو وشەگەلێکی تر دێنێت و دەیکاتە بەڵگە بۆ گەیاندنی واتاکە"(**2**)، مامۆستا عەلائەدین سوجادیش دەڵێت: "وترا ئەگەر شتێك لە ئارادا نەبوو کە وشەکە ببرێ بەسەر گوزارە ڕەسەنیی و نەژادییەکەیدا، ئەوە درکەیە"(**3**).
ئنجا مامۆستا سوجادی نموونەیەك دێنێتەوە لەسەر (درکە):
ئەم بێشەیە بەخاڵی مەزانن زەمانێ بێ
گوێ بگرە جا لە نەعرەیی شێری ژیانمان
بەلای مامۆستا سوجادییەوە ئەمە درکەیە، بەڵام بەلای هەندێ لەشارەزایانی بواری ڕەوانبێژییەوە (خواستنی نواندنە-الاستعارە التمپیلیە) چونکە وێنەیەکی زەینی بە وێنەیەکی هەستپێکراو بەرجەستەکردووە، واتا بەهۆی وێنەی بێشەیەکەوە کەشێری تێدابێت، کە هاتووە و



هەستپێکراوە، وێنەیەکی تری زەینی کە (نیشتمان و پیاوی ئازای تێدایە) پێ بەرجەستەکردوە، نیشتمان بێشەیە و پیاوە ئازاکانی شێرن(**4**).
(د.کامیل بەسیر) لەم بارەیەوە دەڵێت:
"درکە جۆرێکە لەپاشگەزبوونەوە لەبەکارهێنانی واژەی بنەڕەتی، بۆ واتایەك و بەکارهێنانی واژەی تر بۆ ئەو واتایە بەهەندێ شیکردنەوە، دەبێ پەیوەندییەك لەنێوان ئەو دوو واژەیەدا هەبێت"(**5**).
لەئەنجامی خستنەڕووی راو بۆچوونی چەند زانایەکی رەوانبێژی دەربارەی درکە (نوزت ئەحمەد عوسمان) بەم شێوەیە دەیخاتە روو کە "باسی شتێك بکەین بەبێ ئەوەی ناوی بەئاشکرا بێنین"(**6**)، لە لێکدانەوەی ئەم بەیتەشدا دەڵێت:
تۆ کە حۆریت، وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەڕەڕ و سینەیی سۆزانمدا (**91**)
"جەننەت درکەیە بۆ خۆشی"(**7**) و لە پۆلی درکە لەئاوەڵناو دایناوە. بەڵام بەلای هەندێ شارەزایانی ترەوە ئەمە درکە نییە، بەڵکو چواندنی رەوانە چونکە دیدەی بەجەننەتی چواندوە و پێ چوێنراوی خستووەتە سەر چوێنراو، هەروەها لەم رستەیەدا چواندنی وێنەیی ناراستەوخۆ (چمنی) هەیە کەبوونی یارەکەی لەنێو دیدەیدا چواندوە بەبەهەشت و حۆری تێدابێت(**8**).
***
دڵ سیاسەنگ نەبێ مائیلی خاکی وەتەنە
خاڵی لەعلی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە(**524**)
بۆ لێکدانەوەی ئەم بەیتە (مامۆستا مەلا کەریم) دەڵێت: "دڵ سیاسەنگ، بەردەڕەش، کینایەیە لە رەقی"(**9**) بەلای (د.عبدالسلام سالار)یشەوە "سیاسەنگ بەتەنها هیچ درکەیەك ناگەیەنێ، ئەگەر لەدێڕەکەشدا باسی بکەین، ئەوا دەڵێین چواندنە چونکە بەواتای (دڵ وەك سیاسەنگ نەبێ) هاتووە، ئەگەر دۆخی نەفی لەسەر لابەرین دەبێت بە (دڵ سیاسەنگە)، ئێمە لێرەدا دەپرسین ئەگەر ئەمە چواندن نەبێ ئەبێ ئەی (ڕوومەت گوڵە) بۆ چواندنە؟... جابەرای ئێمە دڵ بە سیاسەنگ چوێنراوە، دل: چوێنراوە و سیاسەنگ: پێ چوێنراوە"(**10**).
***



**کەللە وەك جەڕڕەی شەرابی پڕ نیشاگ و تەڕ دەماغ**
**شێری نەڕ، ئاهووی بەڕ، گورگی سەفەر، قەمچی نەچێژ(225)**
(نالی) لە وەسفکردنی گوێ درێژەکەیدا، لەبری ئەوەی بڵێ گورج و گۆڵە، دەڵێت (قەمچی نەچێژ)ە واتا ڕاستەوخۆ نەیوتووە گورج و گۆڵە، بەڵکو بەرێگای پەیوەستێکی گورج و گۆڵییەوە کە (قەمچی نەچێژ)ە ئەمەی وتووە، چونکە گوێ درێژی گورج و گۆڵ پێویستی بە قەمچی لێدان نییە بۆ ئەوەی خێرابێت، ئەوە گوێ درێژی سست و تەمەڵە پێویستی بە قەمچی لێدانە، بۆیە ئەم جۆرە درکەیە لە (ئاوەڵناو) سیفەت.

***

**تۆزی ئایینەی سکەندەر وابەدەم باوە، وەلێ**
**گەردی دامانی غەریبانە بلووری جامی جەم(309)**
نالی سیفەتی (لەناوچوون)ی ڕاستەوخۆ نەداوەتەپاڵ ئەسکەندەر و جەمشید، بەڵکو داویەتیە پاڵ شتێکی سەر بەوان، کە ئەویش ئاوێنەکەی ئەسکەندەر و جامەکەی جەمشید، کەواتە درکەیە لەسیفەت بەرێگەی هاوگرییەوە.

پەراوێزەکان:
-1ئەستێرە گەشە: فاچل نقام الدین، 293
-2دلائل الاعجاز: عبدالقاهر الجرجانی، 52
-3خۆشخوانی: عەلائەدین سوجادی، 125
-4ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی: سوجادی، 90
-5الصوره الفنیه، 328
-6 روونبێژی لەشیعری کلاسیکی کوردیدا: نامەی ماجستێریی نوزت ئەحمەد عوسمان، 130
-7هەمان سەرچاوە
-8ڕەوانێژی لەلای نالی: نامەی ماجستێری د.عبدالسلام سالار، 119
-9دیوانی نالی: مەلا عبدالکریم مدرس، 524
-10 ڕەوانێژی لەلای نالی: نامەی ماجستێری د.عبدالسلام سالار، 119



دووەم: هونەری بەکارهێنان (الاستخدام):
زانایانی زانستەکانی رەوانێژی راوبۆچوونی جیاوایان هەیە لەمەڕ پێناسەکردن و شیکردنەوەی ئەم لقە. بۆ نموونە: سەعدەدینی تافتازانی دەڵێت: "هونەری بەکارهێنان ئەوەیە کە وشەیەك دوو واتای هەبێت، واتایەکیان بهێنێتەوە و واتاکەی تریش بەرێگەی راناوەوە بهێنیتەوە نەك خۆی"(**6**). زانایەکی بواری رەوانبێژیش وای پێناسە دەکات کە "ئەوەیە کە وشەیەك دوو واتا بگەیەنێ، دوایش دوو وشەیتر بهێنیتەوە ئەو واتایانە بگەیەنن جا ئەم دوو وشەیە لەوانەیە پێش وشە هاوبەشەکە بکەون یان دوای بکەون یان بکەوێتە نێوانیانەوە"(**7**).

ومولع بفخاخ  یصیدها وشباك
قالت لی العین ماژا  یصید قلت کراك(**8**)

"لەم دێڕەی سەروەدا واژەی (کراك) دوو واتا دەگەیەنێ:
-**1**واتای یەکەمی (کراك) (کری) بەواتای نەوز، خەو، (ك) راناوە، ئەم واتایە لەگەڵ (العین)دا گونجاوە و تەواو دەبێ.
-**2**واتای دووەمی (کراك) جۆرە مەلێکە ئەم واتایەش لەگەڵ وشەی (یصید)دا گونجاوە و تەواو دەبێ.. هەردوو واژەکەش پێش واژە هاوبەشەکە کەوتوون"(**9**).

نالی وەستایانە ئەم هونەرەی بەکارهێناوە. بۆ وێنە دەڵێت:

رەنگی زەرد و سووری خەوف و خەجڵەتی، ئاوی حەیای
وا تکاو ئەرجوو دەکەن عەفوی بکا وەك عەبدی خۆی(**10**)

لێرەدا نالی وشەی (تکا) ی بەکارهێناوە کە دوو واتا دەدات بەدەستەوە:
-**1**هاتنەخوارێ بەدڵۆپە.
-**2**پاڕانەوە
واتای یەکەمی (تکا) کە دڵۆپەیە لەگەڵ (ئاوی حەیا) دا یەك دەگرێتەوە، واتە (ئاوی حەیا) لەپێش وشە هاوبەشەکەوە هاتووە.
واتای دووەمی (کراك) جۆرە مەلێکە. ئەم واتایەش لەگەڵ وشەی (یصید)دا گونجاوە.
***

قیمەتی ماچی دوو صەد کیسەیی ساغە و نیمە
غەیری یەك کیسەیی صەد پارە لە گیرفانمدا(**91**)

لێرەدا وشەی واژەی



(نیمە) دوو واتا دەگەیەنێ:
-1واتا (نیوە) ئەوەیە کە لەگەڵ وشەی (ساغ)دا دەگونجێ واتە صەد کیسەیی ساغ و نیمە.
-2واتا (نیمە): نەبوونییە کە لەگەڵ وشەی دوایدا دەگونجێ واتا(نیمە تەنیا یەك کیسە نەبێ).
***

خارابی سەوزو شینی لەبەرکردوە جەبەل
دامێنی وەردی سوورە کە دەستم بەدامەنێ(665)
وشەی (وەرد) لەم دێڕەی سەرەوەدا دوو واتای هەیە:
-1واتا (گوڵ) کە لەگەڵ وشەی دواوەیدا کە سوورە گونجاوە.
-2واتا ئەو زەوییەی کە دەکێڵرێ بۆ ئەوەی ئامادەبکرێ بۆ چاندن لەوەرزی داهاتوودا. ئەم واتایە لەگەڵ (دامێنی جەبەل) دا دەگونجێ.

پەراوێزەکان:
-1دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، پیاچوونەوەی: موحەممەدی مەلا کەریم، 488
-2چەپکێك لە گوڵزاری نالی، مەسعود محەمەد، 23
- 3د یو ا نی نالی، 183
-4 چەپکێك لە گوڵزاری نالی، مەسعود محەمەد، 23
-5بڕوانە پێشەکی چاپی ئێران
-6شرح المختصر: سعدالدین التفتازانی، البدیع، 151
-7خزانه الادب وغایه الارب، 52
-8شرح المختصر: سعدالدین التفتازانی، 186
-9نالی و هونەرە دەگمەنەکان: د.عبدالسلام سالار، 76
-10دیوانی نالی، 692





# من و حسێن عارف

## پیاوێکی هێمن و ئەدەبێکی هێمنتر

مەریوان وریا قانع

خوێنەری بەڕێز
ئەوەی لێرەدا دەیخوێنیتەوە کورتە نووسینێکی منە لەسەر ئەزموونی نووسینی مامۆستا حسێن عارف و پەیوەندی ئەو ئەزموونەوە بە منەوە وەك نووسەرێك و بەو نەوەیەوە کە لەدوای نەوەی کاك حسێن عارف و هاوڕێکانییەوە دروستبوون. نووسینەکە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە شاری ئەمستردام لە کۆڕێکدا کە بۆ خەڵاتکردنی کاك حسێن عارف سازکرابوو، خوێندرایەوە. ئەم نووسینە دەربڕینی وەفادارییەکی سەرەتاییە بۆ کارەکانی کاك حسێن عارف و ئەو ڕۆڵەی نەوەی کاك حسێن عارف لە ڕۆشنبیریی کوردیدا گێڕاویانە.
دەقی نووسینەکە:
ئامادەبووانی بەڕێز، سوپاسێکی تایبەت بۆ داوەتکردنم بۆ بەشداربوون لە کۆڕی خەڵاتکردنی یەکێك لە نووسەرە گرنگەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیی لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا. خۆم بەبەختەوەر ئەزانم لەم بۆنەیەدا بە کورتە نووسینێك لەو پەیوەندییانە بدوێم کە من وەك نووسەرێکی

نەوەی دوای کاك حسێن عارف بە کاك حسێن عارفەوە وەك نووسەر دەبەستێتەوە و لەهەندێك ڕوانگەی تایبەتەوە لەو پەیوەندییە بڕوانم. بێگومان مەبەستم لەو پەیوەندییە ئەو پەیوەندییە شەخسییانە نییە کە من وەك کەس بە کەسی کاك حسێنەوە گرێدەدات، چونکە لەم ئاستەدا پەیوەندییەکان ئەوەندەنەبوون شایانی باسکردن و گێڕانەوە بێن، بەڵام پەیوەندی من بە کاك حسێن عارفەوە وەك نووسەر، وەك خاوەنی کۆمەڵێك تێکست و ڕا و بۆچوونی ئەدەبی، وەك جۆرێکی تایبەت لە چێژی ئەدەبی و شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ زمان و نووسیندا، وەك ناوێکی دیار و گرنگی نەوەیەکی ئەدەبی ناو مێژووی ڕۆشنبیریی ئێمە، پەیوەندییەکی گرنگە و لەزۆر ڕووەوە بەشایانی باسکردن و گێڕانەوەی دەزانم. هەر لەم سەرەتایەشەوە دەمەوێت بڵێم بەبێ دروستبوونی نەوە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکەی کاك حسێن عارف و هاوڕێکانی، بەبێ ئەو گۆڕانکارییانەی ئەم نەوەیە لە ئەدەبیاتی ئێمەدا دروستیانکرد، زەحمەت بوو ناوەکانی دوای ئەوان و دونیا ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکەی دوای ئەوان دروستببووایە.

لە دیدی مندا کاك حسێن عارف یەکێکە لەو نووسەرە گرنگانەی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمی ئەدەبیاتی کوردی کە ڕۆڵێکی گەورە و بەرچاوی لە تازەکردنەوەی زمان و تازکردنەوەی شێوازی نووسین و تازەکردنەوەی خەیاڵی ئەدەبی ئێمەدا بینیوە. بەڕادەیەك دەوێرم بڵێم ئەوەی ئەمڕۆ لە واقیعی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی ئێمەدا ئامادەیە هەندێك لە ڕەگ و ڕیشە قووڵەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی نووسین و داهێنانی ئەم پیاوە و ئەو بزوتنەوە ئەدەبییەی کاك حسێن عارف و هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩٧٠ دا هێنایانە کایەوە. مەبەستم لەو بزوتنەوەیەش "بزوتنەوەی ڕوانگە"یە. من لە ساڵی ١٩٧٠ دا قوتابی پۆلی چواری سەرەتایی بووم و لەبەردەمی تەختەڕەشی یەکێك لە قوتابخانەکانی شاری سلێمانیدا هەنگاوە سەرەتاییەکانی فێربوونی نووسین و خوێندنەوە و بیرکردنەوە فێردەبووم، بە شیعر و چیرۆك و ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژگارە، بە دۆخی کورد و کێشە سیاسییە



ئاڵۆزەکانی دونیای کورد، ئاشنادەبووم. ئەگەرچی من وەك منداڵێك ئاگام لە ئەدەبیاتی ئەو سەردەمە نەبوو، ئەوەی دەمناسی تەنها کۆمەڵێك شیعری قانع و حاجی قادری کۆیی و گۆران بوو، ئەوەی لەسەر ئەدەبیات فێریدەبووم لە وانە سەرەتاییانەوە بوو کە لە قوتابخانەی شێخ سەلام لە وانەی کوردیدا وەرماندەگرت و لەو قسە و باسە ئەدەبیانەوەبوو کە لەماڵی خۆماندا باوکم و مام لەگەڵ کۆمەڵێك نووسەران و ڕۆشنبیرانی ئەو کاتەدا ئەنجامیانئەدا، دەڵێم لەکاتێکدا من وەك منداڵێك بە سەرەتاکانی ئەدەب و نووسین لە قوتابخانە و ماڵی خۆماندا ئاشنادەبووم، ڕێك لەو کاتەدا کاك حسێن و هاوڕێکانی خەریکی دەسکاریکردنێکی قووڵ و ڕیشەیی و تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی ئێمەبوون، خەریکی گۆڕان و داهێنانی شێوازی نوێ زمان و نووسین و دارشتن بوون و لەهەوڵی بەرجەستەکردنی دیدێکی تازەشدا بوون بۆ تێگەیشتن لە چییەتی ئەدەب و لە ڕۆڵی زمان و هونەر و نووسین و کاریگەرییەکانیان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی لە کۆمەڵگادا. ئەوەی کاك حسێن و هاوڕێکانی لەو ساڵانەدا ئەنجامیاندا، ئەوەی ئەوان دەیاننووسی و بڵاویاندەکردەوە، چەند ساڵێك دواتر بوو بەو زادە فیکری و ئەدەبی و خەیاڵییەی کە نەوەی من لە قووڵکردنەوەی تێگەیشتنیدا بۆ ئەدەب و نووسین لە نزیکەوە پێیان ئاشنابوو.
بڕێکی بەرچاوی ئەو کتێبانەی من لە ساڵانی هەفتا و سەرەتای هەشتادا خوێندمنەوە کتێبەکانی کاك حسێن عارف و هاوڕێکانی بوون، ئەو تێکستە ئەدەبیانەبوون کە ئەم نەوەیە لەناو ئەزموونێکی تازەی نووسین و بیرکردنەوەدا بەرهەمیاندەهێنا. ئەو تێکستانە یەکێك لەو دەروزە گرنگانە بوو کە نەوەی من بۆ تێگەیشتن لە خۆی و بۆ تێگەیشتن لەو دونیایەی تیایدا دەژین دەمانکردەوە. نووسینی ئەو نەوە ئەدەبییە بە ئێمە ئامرازێکی گرنگی دەبەخشی بۆئەوەی بزانین لە کام بەشی دونیا و لەناو کام میلەت و کام زمان و کام مێژوویی تایبەتەدا دەژین و ئەمەش ببێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی و گرنگی گەشەکردنی هۆشیاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسیمان.
بۆ من کاك حسێن عارف، ئەو پیاوەی ئەمڕۆ ئێمە لێرەدا کۆبووینەتەوە بۆ خەڵاتکردنی، یەکێکە لەو کەسانەی دەست و پەنجە و قەڵەمەکی لەناو خەیاڵ و زمان و نووسینی من و لەناو نووسینی بڕێکی زۆری نەوە ئەدەبیی و فیکرییەکەی دوای ئەواندا، ئامادەیە، ئەو نەوەیەی لە کۆتایی هەشتاکانەوە چوونە ناو دونیای نووسین و ئەدەبیاتی کوردییەوە. ئەگەر هەر نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کۆمەڵێك باوکی ڕەمزی هەبێت ئەوا بێگومان کاك حسێن عارف یەکێکە لەو باوکانەی کە نەوەی



ئێمە ماوەیەکی درێژ گوێیلێگرت و چێژی خۆی لەپاڵ چێژی ئەو و هۆشیاری خۆی لەڕێگای تێکستەکانی ئەوەوە پەروەردەکرد و گەشەپێئەدا بۆ ئەوەی لە ساتێك لە ساتەکەندا هەریەکێکمان بتوانین عەودالی دۆزینەوەی ڕێگای تایبەتی بیرکردنەوە و دەربڕین و نووسینی خۆمان بین و دونیای خۆمان بەوجۆرە ببینین و لێکبدەینەوە کە لەگەڵ تێگەیشتن و خوێندنەوە و ئەزموونی تایبەتی خۆماندا بگونجێت. نووسینەکانی کاك حوسێن عارف بۆ من لەو جۆرە نووسینانە بوون کە دەستیان دەگرتم و دەیانبردمە بەردەمی کۆمەڵێك ڕێگای دیاریکراو، ئەو جۆرە نوسینانەی ماوەیەك لەگەڵتدا دێن بۆئەوەی لەبەردەمی چەند دووڕیانێکدا ڕاتگرن و ئازادی ئەوەت پێببەخشن خۆت ڕێگای خۆت هەڵبژێریت و خۆت بڕیاری خۆت بدەیت و خۆت دونیا و سەرچڵییەکانی خۆت بدۆزیتەوە و بژیت. یەکێك لە ئاکارە سەرەکیی و گرنگەکانی ئەدەبی ئەم پیاوە ئەوەیە کە خۆیت بەسەردا ناسەپێنێت، یەخەت ناگرێت و بەزۆر داوای خوێندنەوەت لێناکات، هاوار و قیڕەقیڕی نییە و هەندێکجار هێندە لەسەرخۆ و هێواش ئەدوێت پێویست دەکات هەموو هۆشی خۆتی پێببەخشی بۆئەوەی بزانی چی دەڵێت. نووسینی حسێن عارف بە دەنگەدەنگ و هاتوهاواریێکی زۆرەوە بەپاڵتا تێناپەڕێت، نووسینێك نییە ڕاگوزەربێت، خێرا بێت و خێرا بیبینیت و خێرا بڕوات و خێرا لەبیرتبچێتەوە، نووسینی حسێن عارف دێت و لەپاڵدا دادەنیشێت، بەهێمنی ڕووداو و بەسەرهات و کێشە سەرنجڕاکێشەکانت بۆدەگێڕێتەوە، کەسایەتییە پڕ پرسیار و گومانکەر و تەنهاکانت پێدەناسێنێت. باسی ئەو شوێن و ئینسان و ڕووداوەنە دەگێڕێتەوە کە نەك تەنها باشیان دەناسێت و بە نهێنییە قووڵەکانیان ئاشنایە، بەڵکو دەشتوانێت سەرنجڕاکێشانە و بە زمانێکی پڕ لە جوڵەی بێئۆقرەوە و بە ڕۆحێکی ئیستاتیکیی ناسکەوە بیانگێڕێتەوە. ئەزموونی ئەدەبی ئەم پیاوە، لەگەڵ ئەو توانا گەورەیەی تازەکردنەوەی بابەت و کەس و ڕووداوەکانیدا، لەگەڵ ئەو زمانەدا کە پشوودان ناناسێت، کەچی یەکێکە لە هێمنترینی



ئەزموونە ئەدەبییەکانی پەنجا ساڵی ڕابردووی ئەدەبیاتی ئێمە. چیرۆکەکانی کاك حسێن عارف وەك خۆی وان، هێمنن بەڵام پڕن لە نهێنی و نادیار و جوڵە و ئاسۆی نەبینراو، هەریەکێکیش لەمانە پێویستیان بە خوێندنەوەی لەسەرخۆ و ورد و هەمەلایەن هەیە بۆ دۆزینەوەی مانا و دەلالەتە نهێنی و ئاشکراکانیان. ئەدەبی کاك حسێن عارف ئدەبی قسەکردنە لەڕێگای چرپەوە، ئەدەبێکە لەدەرەوەی ئەو قیرەقیرە نائیستاتیکی و ناهونەرییەوە کە لە بەشێکی بەرچاوی تێکستە ئەدەبییەکانی ئەو سالآنە و سالآنی دواتریشەوە هەڵدەستێت. ئەدەبێکە لەسەرخۆ و بەدەنگێکی نەرم ئەدوێت، بەلآم شتگەلێکی زۆر و پڕنهێنی و پرسیارکەر دەڵێت.

کتێبەکانی کاك حوسەین عارف بۆ من ئەو کۆمەڵە کتێبە بوون کە کۆمەکێکی گەورەیان کردم چێژ و زەوق و خەیاڵی خۆم بە زمانێك گەشە پێبدەم کە زمانی کەشف و دۆزینەوەی بەردەوامە. زمانێکی هێمن، بەلآم پڕ جوڵە و نائارامییەکی قووڵ. نووسینەکانی ئەم پیاوە وایان لێکردم بەوە ڕازینەبم لە ڕووکەش و دیویدەرەوەی تێکستەکاندا بمێنمەوە، لەپشتی هێمنی تێکست و گێڕانەوە و وێنەکانەوە بەدوای قووڵاییەکی نادیار و ئاڵۆزدا بگەڕێم کە بە ئەدەب ئەو مانا تایبەتانە دەبەخشن کە لە تێکستە نائەدەبییەکان جیایاندەکاتەوە. ئەدەبی کاك حسێن عارف لەم ئاسەتدا هەڵگری خەسڵەتێکی تایبەتە، لەناو مێژووی تر و لەناو جوانیدا جوانیتر و لە مرۆڤدا مرۆڤی تر ئامادەیە، پەیوەندییەکی فرەقوڵاییش لەنێوان مرۆڤ و ژینگە سروشتی و ئینسانییەکەیدا پێشنیاردەکات، لەم پەیوەندییەدا نە فرمێسکی درۆ و نە پێکەنینی درۆ و نە چاوەڕوانی درۆش لەو مۆرڤانەدا نابینیت. هەموو ئەم شتانە کە لەئەدەبی ئەم پیاوەدا ئامادەیە، یان لانیکەم من لە خوێندنەوەمدا بۆ ئەم ئەدەبە دیومە و ئەزموونم کردوە، ڕاستەوخۆ بوون بە بەشێك لە دید و دونیابینی و تێگەیشتنی من بۆ ئەدەب بەتایبەتی و بۆ نووسین و بەرپرسیارێتی بەگشتی. بەبۆچوونی من نووسەری باش و سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە بەشێك لە ڕۆحی خۆی لەناو ڕۆحی نووسەرەکانی سەردەمی خۆی و دوای خۆیدا و لەناو ڕۆحی زۆرێك لە خوێنەرەکانیدا بەجێدەهێڵێت، سێبەرێك لە سێبەرەکانی خۆی دەبەخشێتە سەردەمەکەی خۆی و هەندێك تارمایشش بەرەو ئایندە و بۆ مرۆڤەکانی دوای خۆی دەنێرێت، پێموایە کاك حوسێن عارف چ لەبەخشینی بڕێك لە ڕۆحی خۆی و چ لە بەخشینی هەندێك لە سێبەرەکانیدا بە نووسەران و خوێنەران و سەردەمەکەی خۆی و چ لەناردنی بڕێك لە تارماییش بۆ ئایندە، پیاوێکی بەخشندەبووە، ئەم پیاوە لە ساڵەکانی تر و سەردەمەکانی تریشدا دەخوێندرێتەوە






و زمانەکەی دەڕوات بۆ ئەو ڕۆژگارانەی زمانی زۆر نووسەری تری تێدا بزردەبێت.
من ئەمڕۆ لەم هۆڵە سادەیەدا ئامادەم بۆ ڕێزگرتن لەو پیاوەی کە ناتوانم مێژووی نووسین و گەشەکردنی چێژ و یارییەکانی خەیاڵم لەدەرەوەی کاریگەرییەکانی ئەو و ئەو نەوەیەدا ببینم، کە ئەو یەکێکە لە داهێنەر و تازەگەرە گرنگەکانی. بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر و وردتر بدوێم واباشترە زۆر کۆنکریتتر لەخۆم بپرسم من چی لەو پیاوەوە فێربووم؟ یان گەر بمەوێت بەناوی نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەوە بدوێم دەکرێت بپرسم ئێمە چی لەم چیرۆکنووسە هێمنەوە فێربووین؟ کامانەن ئەو شوێنپەنجانەی ئەو بەسەر جەستەی نووسین و جەستەی ئەزموون و جەستەی ئەدەبیی ئێمەوە جێیهێشتوون؟ ئاشکرایە من ناتوانم لە بۆنەیەکی لەم بابەتەدا هەموو ئەو شوێنپێ و شوێنپەنجە و دەنگدانەوانە بدۆزمەوە و بگێڕمەوە کە کاک حسێن عارف و نەوەی کاک حسێن عارف لەناو من و بڕێکی ڕۆر لە نەوەی مندا بەجێیانهێشتوە.

دۆزینەوەی ئەو شتانە پێویستیان بە سەفەرێکی دورودرێژ و قووڵ هەیە بەناو خەیاڵ و زمان و ڕۆحیەتی ئەدەبی و فیکریی ئەو نەوەیەدا کە دوای کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی لە ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیدا پەیدابوون. دەڵێم من نەکاتی ئەوەم هەیە و نە لەوەشدەچێت ئەنجامدانی کارێکی لەو بابەتە مەسەلەیەکی ئاسان بێت. بەڵام ئەوەی لێی دڵنیام و دەمەوێت لێرەدا وەك وەفایەك بۆ کاك حسێن عارف باسیبکەم، ئەم چەند خاڵەی خوارەوەیە:
یەکەم: یەکەمین ڕاستییەك کە من لەم پیاوەوە فێریبووم ئەوەیە هەر نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی دەبێت دەنگ و ڕەنگ و ڕۆح و زمان و خەیاڵ و چاوەڕوانی و ئومێد و نوشوستی خۆی هەبێت. هیچ نەوەیەك نابێت ئەزموونی نەوەکانی بەر لەخۆی دووبارەبکاتەوە و ئەوەی نەوەکانی تر کردوویانە و گوتویانە بە زمانێکی دیکە بنووسێتەوە. نەوە ئەدەبییەکان مەحکومن بەوەی بەشێوەی تایبەتی خۆیان دونیای خۆیان بژین و ئەزموونی تایبەتی خۆیان لەگەڵ خەیاڵ و بیرکردنەوە و زمان و واقیعی خۆیاندا بژین. لە کوێدا نەوەکانی

میللەتێك لەیەكچوون لەوێدا ئەو میللەتە لە گۆڕان وتازەبوونەوە و موغامەرەی گەڕان و دۆزینەوە و داهێنان كەوتوە. ئەمەش تراژیدیایەكی گەورەیە بەسەر هەر نەتەوە و میللەت و كۆمەڵگایەكدا بێت. جوانی كۆمەڵگایەكی دیاریكراو بە جوانی جیاوازییەكان و داهێنانەكانی دەپێورێت. ئەو كۆمەڵگایەی خەریكی خۆدووبارەكردنەوە بێت كۆمەڵگایەكە لە ڕۆخی مردندایە، لە قەبرستانێكی بێدەنگەوە نزیكە تا لە رووبەرێكی پڕجوڵەوە. یەكەمین ڕاستی كە من لەم چیرۆكنووسە داهێنەرەوە فێریبووم ئەو هەوڵی خۆتازەكردنەوە و خۆجیاكردنەوەیەیە كە بە ئینسان و ئەدەب و كۆمەڵگا، مانا و جوانی و قووڵایی تایبەت دەبەخشێت. كاك حسێن و هاوڕێكانی ڕوانگەیان پێشكەش بە دونیای ئێمەكرد، بەمەش نەك تەنها خۆیان و ئەدەبیاتی سەردەمی خۆیان تازەكردەوە، بەڵكو ئێمەشیان ناچاركرد بەدوای ڕێگای تر و دەربڕینی تر و زمانی تر و بابەتی تر و سەلیقەی ئەدەبی و فیكری و تیوری تردا بگەڕێین. ئەوان كە مێژوویەكی تایبەتیان بۆ تازەكردنەوە دروستكرد و چەند وێستگەیەكی گرنگیشیان لەو مێژووەدا دروستكرد، هەموو نەوەكانی دوای خۆشیان بەوە مەحكومكرد كە وێستگەی تایبەت بە خۆیان دروستكەن و نەچنە ژێر چەتری نەوەكانی بەر لە خۆیانەوە.
دووهەم: كارێكی گرنگی دیكە كە من لەم پیاوەوە فێریبووم ئازایەتییە لە باوشكردنەوەدا بۆ گۆڕان و تازەبوونەوە، نەترسان لە تێكشكانی قاڵبە كۆنەكان و زمانە كۆنەكان و ئیقاعە كۆنەكان، نەترسان لە بازدان بەسەر هەموو ئەو شتانەدا كە لە ساتەوەختێكی دیاریكراودا وەك موقەدەس مامەڵەدەكرێن. نەترسان لەوەی كە بەهۆی ڕاستگۆبوون لەگەڵ خۆتدا دونیای دەرەوەی خۆت بدۆڕێنێت. پێموایە كاك حسێن عارف و هاوڕێكانی یەكەم نەوەی ناو ئەدەبی كوردین كە بەدەم ئەو قسەیەی مەسیحەوە چووبن كە دەڵێت: "چ سودێكی هەیە هەموو دونیا ببەیتەوە، بەڵام خۆت بدۆڕێنیت". هەستدەكەم كاك حوسەین و نەوەی كاك حوسەین بەڕادەیەكی زۆر سڵیان لەوە نەكردەوە لەپێناوی بردنەوەی خۆیاندا دونیا بدۆڕێنن. لانیكەم ئەم ئامادەگییە لەناو ژمارەیەكی بەرچاویاندا ئامادەبوو. ئەمانە لە ساتەوەختێكدا كەوتنە سەر تازەكردنەوەی ئامرازەكانی دەربڕین و نووسین كە دونیای دەرەوە داوای دووبارەكردنەوەیەكی بێكۆتایی لێدەكردن. لەم پێناوەشدا كەوتنە بەر پەلاماری هەموو ئەوانەی لە تازەبوونەوە دەترسن و لە تازەبوونەوە ڕادەكەن. تازەكردنەوە لە كۆمەڵگایەكی تەقلیدیدا و لەناو ڕۆشنبیری و فەرهەنگێكی تەقلیدیدا سەرچڵییەكی گەورەیە، تەنها ئەوانەی خەونی گەورە و حەزی گەورە و چاوەڕوانی گەورەیان هەیە دەتوانن كاری لەو جۆرە بكەن.





هەموو کردەیەکی تازەگەریی چەند پێویستی بە دونیابینی و زمان و خەیاڵی نوێ هەیە، ئەواش پێویستی بە بڕێکی زۆر لە ئازایەتی و وێران هەیە. ئەوەی من لە کاك حسێن عارف و نەوەکەیەوە فێریبووم ئەم وێران و ئازایەتییە، لانیکەم تێگەیشتنە لەو خاڵەی کە ناکرێت تازەگەربین و ترسنۆك، نارکێت بیر لە گۆڕانی خۆمان و لە گۆڕانی دونیا بکەینەوە، بەڵام لەناوەوە ترس بوونمانی ڕەنگڕێژکردبێت. ئەم نەوەیە ئەم وانەیەیان بەشێوازی جیاواز و لە ساتەوەختی جیاوازدا بۆ نەوەکانی دوای خۆیان بەجێ‌هێشت.

سێ‌هەم: ئەو وێنەیەی من لەسەر کاك حسێن عارف و نەوەکەی کاك حسێن عارفم هەیە، لەپاڵ نووسەربوون و ڕۆشنبیربووندا، وێنەی جەنگاوەرە. وردتر بدوێم وێنەی نووسەر و ڕۆشنبیری جەنگاوەرە، وێنەی نەوەیەکە دیدێکی جەنگاوەرانەیان بۆ نووسەر و نووسین و ڕۆشنبیر و ڕۆشنبیریی هەیە. نووسین لای ئەمان پیشەیەکی ئاسایی لە پاڵ پیشەکانی تردا نییە، وەك لە یەکەمین بانگەوازی ڕوانگەدا دەڵێن، نووسین "ڕاپەڕینە لەناو ڕاپەڕیندا".

لای ئەم نەوەیە ووشە "شۆڕشگێڕە" و "بەهرەی تازەکردنەوە" پێدراوێکی خودایی و سروشتی نییە، بەڵکو "جەنگاوەرێکی ئازاو نەبەرد"ە، مرۆڤبوونە لە دۆخی یاخیبون و نارازیبوون و پرسیارکردنێکی بەردەوامدا. لای ئەم نەوەیە نووسین پیشە یان خویەکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو، وەك دەڵێن، کردەیەکە دەنگی "ئازادیی"بەرزدەکاتەوە. گرێدانی نووسین بە "ڕاپەڕینی ناو ڕاپەڕین" و بە "شۆڕش" و "ئازادیی"ەوە، گرێدانی کەسایەتی نووسەریش بە کەسایەتی "جەنگاوەرێکی ئازا و نەبەرد"ەوە لە داهێنانە هەرە سەرەکی و هەرە گرنگەکانی ئەم نەوە ئەدەبییەی دونیای ئێمەیە. ئەم نووسەرە جەنگاوەرانە یەکەمین ڕستە پرسیارێك لە خۆیان کردبێت ئەمەیە: نووسەری ئەمڕۆکە کێییە؟ چ جۆرە بوونەوەرێکە؟ ئەرکە سەرەکییەکانی کامانەیە؟ لە بانگەوازی یەکەمی دروستکردنی بزوتنەوەی ڕوانگەدا بەم شێوەیە وەڵامی ئەم پرسیارە سەرەکییانە ئەدەنەوە: "نووسەر و شاعیری ئەمڕۆ، شانبەشانی پیشەی

نووسین و شیعروتنی کارگێڕیشه.. شۆڕشگێڕیشه...جەنگاوەریشه..". ئەوەی ئەم ووشانە بخوێنێتەوە بۆیدەردەکەوێت ئەمان نووسین زۆر بە توندی بە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە گرێئەدەن، مەسافەیەك لەنێوان نووسین و بیرکردنەوە و کردەوەی شۆڕشگێڕانە لەناو واقیعدا ناهێڵنەوە. ئەمان ئەو نەوەیەن کە بەنووسین ڕەهەندێکی پراکتیکی سیاسیی دەبەخشن، شۆڕشگێڕبوون لەناو تێکستدا و شۆڕشگێڕبوون لەناو واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بەیەکەوە گرێئەدەن، شەڕی تێکست لەگەڵ دونیادا و شەڕی نووسەر لەگەڵ دونیادا وەك یەك شەڕ دەبینن، جیاوازییەك نابینن لەنێوان مرۆڤێك بە وشە بجەنگێت لەگەڵ مرۆڤێك لەناو شۆڕشێکدا ئامادەبێت. زاڵبونی ئەم ڕۆحی جەنگاوەربوونە بەسەر تێکست و خەیاڵ و دیدی ئەدەبی ئەم نەوەیەدا، لەساڵە زەحمەت و قورسەکانی دوای هەرەسی ساڵی ١٩٧٥ دا، بۆ من و بۆ نەوەی من کارێکی لەڕادەبەدەر گرنگ بوو. ئەو نووسەرانە تەنها نووسەر نەبوون، بەڵکو نووسەری میلەتێکی بریندار و وێرانکراوبوون، تەنها کەسانێك نەبوون قووڵایی برینەکانیان دەبینی، بەڵکو دەیانوویست ئەودیوی برینەکانیش ببینن. ئەم ڕوانینە بۆ ئەدەب و بۆ نووسین بە توندی بە مێژووی پڕ لە تراژیدیای کۆمەڵگای ئێمەوە گرێدراون، ئەم نەوەیە فێری ئەوەیانکردین کە ئێمە هەرچییەك بکەین و هەرچییەك بنووسین، ئێمە نووسەری میلەتێکین ناوی کوردە، بەشێکین لە کوردبوونێك کە پڕە لە خوێن و برین و ئومێد و نائومێدیی. هەموو ئەمانەش بەسەریەکەوە دروستکەری جۆرێکی تایبەتن لە ئیستاتیکا، کە دەشێت لەگەڵ ئەو نەوەیەدا و لەپاڵ ئەو نەوەیەدا بە "ئیستاتیکی جەناگاوەریی" ناوییبەین. لەمێژووی کەم میلەتەدا نووسینی ئەدەبیات ڕیسکێکی بنەڕەتی و گەورەبووە بەو ئەندازەی ئەوەی لە مێژووی ئێمەدا ئامادەبووە، نووسەری دونیای ئێمە زۆر بە بەئاسانی ژیانی خۆی لەپێناوی نووسینی شیعرێك یان خوێندنەوەیدا لەدەستداوە. پەیوەندییەکی بێوێنە لە ئەدەبیاتی ئێمەدا لەنێوان نووسین و مردندا هەیە، پێموانییە لە ئەدەبیاتی هیچ میلەتێکی تردا ئەم پەیوەندییە بەڕادەی ئەدەبیاتی ئێمە بەهێز و هەمەلایەن بێت. زمان لەم ئەدەبیاتەدا ڕێگەیەك بووە بەرەو مردن، وەکچۆن مردن لەبەردەرگای زۆربەی هەرەزۆری تێکستە جەنگاوەرییەکاندا ئامادەبوە. یەکێك لە ئەرکە هەرە سەرەکی و هەرە گرنگەکانی نەوە ئەدبییەکەی کە کاك حسێن عارف ئەوەیە ئەو پەیوەندییە ترسناکەی لەنێوان نووسین و مردندا هەیە، دەگۆڕن بۆ تەحەداکردنێکی بوێرانە و بەردەوامی ئەو دونیایەی ئەو هاوکێشە سەخت و ئەهریمەنییەی دروستکراوە، تەحەدایەك هەموو مرۆڤێکی



ساده و پاك، هەموو نووسەرێك بە ویژدانێكی زنیدووەوە بژی، دەگۆڕێت بۆ جەنگاوەرێكی ئەفسانەیی. بەخشینی ئەم ڕەهەندە جەنگاوەرییە بە تێكستەكان جۆرێك لە هێز و باوەڕیی ناوكی بە ئێمە ئەبەخشی، بە "ئێمە" مەبەستم بەو منالآنەیە كە لە سالآنی هەفتادا هۆشیاریمان بەڕووی دونیادا دەكرایەوە و لەسەرەتای ناسینین خۆمان و دونیای دەوروبەرماندا بووین. ئەم تێكستە جەنگاوەرانە، بەهەر زمانێك دوابن، هاریكارمان بوون لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو دونیا سەخت و بێدڵ و كوشندەیەدا كە ئێمە وەك منداڵ و وەك گەنجی ئەو ڕۆژگارە كەوتینە ناوییەوە. ئەو ئەدەبەی ئەم نووسەرانە دەیاننووسی هێزی مانەوە و چێژوەرگرتن و گەشبینی و باوەڕبوونی بە خۆمان و بە دونیا پێدەبەخشین. ئەدەبی ئەو نەوەیە ئەدەبێكی دژەبەعسە بەهەموو ئەو مانایانەوە كە بەعس وەك پرۆژەیەكی ترسناكی تەسلیمبوونی مرۆڤ و تەلسیمبوونی كۆمەڵگا هەڵگریەتی.

چوارەم: هەر ئەم مەسەلەیە بەرە و خاڵی چوارەمم دەبات كە بریتییە لەو پێناسەیەی كاك حسێن و هاوڕێكانی بۆ ڕۆژگار و سەردەم و ساتەوەختی ئامادەگی خۆیان وەك نووسەر دەیكەن. ئەمان وەك ووتم گەر تازەكردنەوەی ئەدەبیان وەك "ڕاپەڕین لەناو ڕاپەڕین"دا وێناكردبێت، ئەوا ڕۆژگار و سەردەمەكەی خۆشیان وەك ڕۆژگار و سەردەمێك وێناكردوە كە پێویستی بە ڕاپەڕین و تازەكردنەوە و دەسكاریكردنی بەردەوام هەیە. ئەم پیاوە سەدەكەی خۆی وەك سەدەیەك وێناكردوە كە "مرۆڤ تیایا دەستەویەخە ڕووبەڕووی ئەو گورگی مردنانە ئەجەنگێت كە ئەیانەوێ ژیانی لێ بكەنە شانۆیەكی نائومێدی و ورەبەردان و دەستەوسانی، تا وەك هەر نێچیرێكی لاواز و بەستەزمان دەم بنێنە لاكی". ئەم وێنەیە بۆ ئەو سەردەمەی كە تێیدا دەژین وێنەیەكە ئاشنا بە ڕۆحی من و بە ڕۆحی ئەوە نەوە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەش كە دوای كاك حوسێن عارف و هاوڕێكانی هاتەكایە. ئەو پێناسەیەی ئەوان بۆ دونیای خۆیان كردوە وەك دونیایەكی ناشیرین و دژەمرۆڤ كە پێویستی بە بەرەنگاربوونەوە هەیە بۆ دونیای ئێمەش هەر ڕاستبوو، گەرچی



شێوازی ناشیرینییەکان و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەکان تا ڕادەیەکی زۆر جیاوازبوون. شەڕکردن دژ بە سەدە و ڕۆژگارێکی پڕ نائومێدیی یەکێکە لە ئاکارە سەرەکییەکانی نووسین و خەیاڵی ئەدەبی کاک حوسەین عارف و نەوەی هەفتاکان و ئەو نەوەیەش کە من یەکێکم لە نووسەرەکانی. ئەوەی کە مرۆڤ لە جەنگێکی دەستەویەخەدایە لەگەڵ ئەو دونیایەدا کە تیایدا دەژی، بەشێکە لەو ڕوانینەی کە دواتریش لای بەشێکی زۆری نەوە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکانی تری ناو دونیای ئێمەدا بەردەوامی هەیە.
کاک حسێن و هاوڕێکانی هەر لە بانگەوازی یەکەمی ڕوانگەدا دەربارەی ئەو سەدەیەی تێیدا دەژین دەنووسن ئەم سەدەیە "سەدەی هەڵگێڕانەوە و یاخیبوونە. بەرامبەر سەراپای مەیدانەکانی ژیان". بینینی سەدەی بیستەم وەك سەدەی یاخیبوون و قبووڵنەکردنی پێدراوە نائینسانییەکانی ئاکارێکی تری ڕوانینەکانی ئەم نەوە ئەدەبییەیە. یاخیبوون تەنها بەرامبەر دەرکەوتێك لە دەرکەوتەکانی ژیان نا، بەڵکو بەرامبەر بە هەموو ژیان، " بەرامبەر سەراپای مەیدانەکانی ژیان". ئەم نەوەیە پێناسێکی بۆ یاخیبوون هێنایەکایەوە کە ڕووی لە گۆڕینی سەرتاپای ژیانە، وەڵامی ئەم نەوەیە بە دونیایەکی ناشیرینکراو دەسکاریکردنێکی ڕیشەیی هەموو ئەو دونیایەیە. نەوەی منیش تا ئەوپەڕی هێڵەکە لەگەڵ ئەم پێناسەیەدا بۆ یاخیبوون کۆکە و تا ئەمڕۆش لەزۆر ڕووەوە لەگەڵیدا دەڕوات. ئەم ویست و ئیرادەی گۆڕانە، ئەو ڕۆحی گەشبینییەی ئەم نەوەیە لەو ڕۆژگارە تاریکەدا دەیچاند وزەیەکی زۆری بەبەری ئێمە و بەبەری ئەو مێژووە سەختەدا دەکرد کە ڕۆژانە لەبەردەممماندا دروستدەبوو، مێژوویەك کە چەندە خوێناوی و پڕ لە ویستی وێرانکاری و تەسیلمبوون بوو، ئاواش پڕ لە ویستی یاخیبوون و تەسلیمنەبوون بوو. یەکێك لە داهێنانە گرنگەکانی ئەم نەوەیە ئەوەیە کە بەردەوام پێ لەسەر پێویستی یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە لە دونیا دادەگرێت. من کە ئێستا بیر لە ساڵانی دوای هەرەسی هەفتا و پێنج و گەورەبوون و بەهێزبوونی بەعس و ساڵە زەحمەتە خوێناوییەکانی هەشتاکان دەکەمەوە، زۆر زیاتر لە گرنگی ئەو هێز و وزە ناوەکییە تێدەگەم کە نووسینی ئەو نەوەیە لەو ساڵەنەدا بە کۆمەڵگا و نەوەی ئێمەی دەبەخشی، وزەیەك وایدەکرد باوەڕمان بە خۆمان وەك مرۆڤ و بە کۆمەڵگاکەمان وەك کۆمەڵگا هەبێت.
پێنجەم: یەکێك لەو ڕستانەی کاک حسێن عارف کە من تا ئێستاش لەبیرمنەچۆتەوە، ڕستەیەك کە من ئێستا بەوردی بیرم نایەت کەی و لە کوێ و لە چ بۆنەیەك لە بۆنەکانی ساڵانی هەفتادا خوێندومەتەوە، ڕاستییەکی هێجگار گرنگی



بۆ ئاشکراکردم کە دواتر لانیکەم لای من، ڕۆڵێکی گرنگی بینی لەدارشتنی ئەو پەیوەندیەدا کە من وەك مرۆڤ بەو ساتەوەختەوە گرێئەدات، کە تیایدا دەژیم. کاك حسێن عارف لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە کارەکانی ئەو و هاوڕێکانیانی وەك "سەرلێشێوان" و "لاساییکردنەوە" و "ئاژاوە" و "مناڵبازاڕی" و "گێرەشێوێنی" و "پیلانی" گەورە دەنرخاند، دەڵێت مەرجنییە "ئەوانەی بە لەش لە ساڵی ١٩٧٠دا دەژین بە عەقڵ و هۆشیش لەو ساڵەدا بژین". ئەم ڕستەیە یەکێك لە ڕستە گرنگەکانی ژیانی من بوو بەدرێژایی ساڵانی هەفتا، دەروازیەك بوو بەهۆیەوە هەم لە ڕەخنەی بێمانا و کۆنەپارێز ڕادەمام و هەم لەو پەیوەندییەی مرۆڤ بەسەردەمەکەی خۆیەوە گرێئەدات. پێموایە ئەم دەستنیشانکردنە تایبەتی پەیوەنی مرۆڤ بەسەردەمەکەی خۆیەوە یەکێکە لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی تازەگەریی. تازەگەرەکان ئەو بوونەورانەن کە دەترسن لە سەردەمەکەی خۆیاندا نەژین، دەترسن بە لەش لە سەدەیەکدابن بەڵام بە ڕۆح و عەقڵ و بیرکردنەوە و ڕوانین لە سەدەیەکی تردا. تازەگەریی مانای ژیان لەناو سەردەمێکدا بەڕۆحی ئەو سەردەمە خۆیەوە، بەتایبەتی بەڕۆحی ئەو ساتەوەخت و ئەگەرانەوە کە ئەو سەردەمە بە ئایندەوە گرێئەدات. تازەگەران ئەو کەسانەن کە یماندەڵێن کە لەسەدەی بیستەمدا ژیان ڕۆحی سەدەی نۆزدەهەمتان لەبەردانەبێت، کە چونە سەدەی بیست و یەکەمەوە نەکەن بەڕۆحی سەدەی بیستەمەوە بژین. ئەم وانە گرنگە یەکێکە لەو وانانەی کە من وەك گەنجێکی ساڵانی هەفتا لەم نووسەرە گەورەیەی ئەو ساڵانەوە فێریبووم.

لە کۆتاییدا من زۆر خۆشحاڵم ئەم هەلەم بۆ من ڕەخسا بتوانم لەنزیکەوە ئەم قسانە لەڕووی ئەم نووسەرە خۆشەوسیتەدا بکەم، بەشێك لەو قەزەی لەسەر شانمە بەم پیاوە هێمنەی ببەخشمەوە. هیوادارم تەمەنێکی درێژ و پڕ هێمنی و پڕ نووسینی لەپێشەوە مابێت. هەر بەختەوەربێت. ڕێزێکی گەورەم بۆی هەیە.



# گرنگیدان بە کاراکتەر لە ڕۆماندا

میران ئابراهام

زۆر ڕای جیاواز هەیە لەسەر زەروریەتی یان گرنگی پێدانی کاراکتەر لە ڕۆماندا، هەرچەندە زۆرێك لەوانەی کە هەڵگری بیرۆکەی هاوچەرخن لە بواری نووسینی ڕۆماندا پێیان وایە، کە کاراکتەر پێویستە تەواو ناسراو بێت، وەکو چۆن جیهانی ناو ڕۆمانەکە پێویستیەتی و دەخوازێت، کاراکتەر دەبێت لە خوێن و گۆشت و ئێسقان خوڵقێنرابێت و بە لە ڕەچاو گرتنی جیهانی ناو ڕۆمانەکە ڕۆحی بەبەرداکرابێت و خاوەنی هەرپێنج هەستەکە بێت، کەواتە وەکو هەر مرۆڤێکی ئاسایی دەبێت خاوەنی ناو و ڕەوشت و ڕەنگ و ڕەواڵەتی تایبەت بە خۆی بێت، لە ناو هێنانی هەر پێنج هەستەکە مەبەست لەوەیە کە

بۆ نموونە نووسەر تەنها کاراکتەر لە ڕێگای بینینەوە بەکارنەبات بۆ گەڕانەوەی بۆ ڕابردوی و گێڕانەوەی یادگارییەکانی، کە بینین تەنها فاکتەر نەبێت بۆ تێکلاو بوونەوە بە خەیاڵمان و دۆزینەوەی یان بەدەست کەوتنی یادگارییە خەزن کراوەکان لە قولایی ڕۆحماندا، بەڵکو لە ڕێگەی بۆنکردن و دەست لێدان و تامکردن و بیستنیشەوە بە هەمان شێوەی بینین بەکاریان بەرێت لە گێڕانەوەی یادگاریەکانیدا، بەدەر لەوەی کە ئەگەر کەسایەتییەك کەڕ یان کوێر بێت بۆ نمونە کە ئەوە ئاشکرایە و ئەوکات پێویست ناکات.

لێرەدا دەتوانین سەرنج بدەین کە چۆن نووسەر هیوا قادر، لە (سەفەرنامە، لاپەڕە 134 دێڕی شانزە)دا چۆن دەیەوێت لە ڕێگەی هەستەکانییەوە لە ئێستایەوە ئەوسای شار بخوڵقێنێتەوە، کە هەرچەندە ئەم کتێبە ڕۆمان نییەو ژانرەکەی "ئەدەبی سەفەر"ە، بەڵام نمونەیەکی باشەو پڕاو پڕی مەبەستی منە لێرەدا... "ڕۆژانە بە هەموو ئەو کۆڵان و گوزەرانەدا ڕەتدەبووم، جەستەم بووبووە چاوێکی گەورە، چاوێك کە بەهەموو هەستەکان ببینێت، چاوێك تینوو بەبینینی هەموو دیمەنێك، هەستم دەکرد، دیوار و خانوەکان و درەختەکانی شار تێکڕا پیربوون، پیرییەك وەك پیری باوکم تەسلیم بە مردن بووە و چاوەڕوانی کردنەوەی ئەو دەرگایەیە تا بەیەکجاری بڕوات و نەگەڕێتەوە، درەختەکان پەژموردەتر، دیوارەکان چلکن و کەلێن تێکەوتوو و درزتێبووتر لەجاران هەموو شتێك گۆڕدرابوو."

پاشان هەر لە سەفەر نامەی هیوا قادر داو لە لاپەڕەی 135 دا، نوسەر پەنا دەباتەوە بەر یەکێك لە هەستەکانی و بە خواسی ئەوەی بەڵکو، بتوانێت شیوازی ئەوسای شار و شوناسی ونبووی زێدەگای خۆی زیندوو بکاتەوە، بە گەڕان بە کۆڵانەکاندا و لە ڕێگای بینین و بیستن و بۆن و دەستلێدان و تامکردنەوە، پەی بەرێت بە یەکێك لەو یادگارییە هەڵگیراوانەی کە لە قولایی ڕۆحیدا خەزنی کردوون، ئەو یادگاریانە کە وێنەی ئەوسای شارن و ڕۆحی نووسەر پێشتر پێیان ئاشنابووە... "دەموویست لەڕێگای یادگارییەکانمەوە ئەو شوناسە دوورەدەست و ونبووەم جارێکی تر نوێ بکەمەوە، بەکۆڵانەکاندا دەرۆشتم، بەدزییەوە بەکامێرا وێنەی ئەو منداڵانەم دەگرت کە بە بەرد



و خۆڵ و يارييە شكاوەكانيان، سەرقاڵی بەفەنتازياكردنی ژيان بوون."

## ووتاری كاراكتەر

توانای بيركردنەوەی كاراكتەر پێويستە لەگەڵ ووتاريدا يەكانگير يان لە ئاستێكدا بێت و لەگەڵ جيهانی خوڵقينراوی ناو ڕۆمانەكە نە كورت بێنێت و نە زيادە ڕۆيی تێدا كرابێت، چونكە تايبەتمەندێتی كاراكتەر دەبێتە هەڵگرو خوڵقاندنی ڕوداو "پلۆت". كەواتە گرنگە كاراكتەر خاوەنی دەنگ و شێوازی دەربڕينی ووتاری تايبەت بە خۆی بێت و لێدوانی ئەو لەگەڵ ئاستی ڕۆشنبيرييدا تەريب بێت و مرۆڤی سەردەمەكەی خۆی بێت، لە هەمانكاتدا لەگەڵ جيهانی خوڵقێنراوی ناو ڕۆماندا هاوسەنگ بێت و دودڵی و گومان لای خوێنەر دروست نەكات. گرنگە خوێنەر سەرسام بێت بە ڕەفتار و لێدوان و ووتاری كاراكتەری ناو ڕۆمان. بەڵام سەرسام كردنی خوێنەر بە كاراكتەرێك كە لە واقيعدا نمونەی هەبێت... نەوەك بۆ نمونە : كاراكتەرێك بخوڵقێنی كە عارەبانچی و چەقۆ وەشێنی ناوشاری سلێمانی بێت، كە لە نێوان ساڵانی شەستەكان بۆ سەرەتای هەشتاكاندا ژيابێت و هەڵگری خەياڵێكی فەلسەفی و جيهانبينی بەرفراوان و قسەكەر و خەمخۆری هەموو كێشەی نەتەوەكەی بێت بە ڕابردوو ئێستاشييەوە... پێويستە هەموو خوێنەرێكی ڕۆشنبير بزانن كە نەخشاندن يان دروستكردنی كاراكتەری فاڵس"تەزووير"، ئەم جۆرە هەڵانە كە دەكرێن و كراون لە ڕۆمانی كورديدا بونەتە هۆی دروست بوونی هەزاران مرۆڤی بێ كاراكتەر لە ناو كۆمەڵگای كورديدا..

ئێمە دەبيت ئەوەشمان لەبير نەچێت كە ديالۆگ زۆر گرنگە بۆ ئاشنا بوونی خوێنەر بە كاراكتەر، لە ڕێگەی ديالۆگەوە خوێنەر ڕاستەوخۆ دەنگی كاراكتەر دەبيستێت و باشتر دەيناسێت.

### مێژوو يان پاشبنەمای كاراكتەر (ناساندنی كاراكتەر)

كاراكتەرەكانی ناو هەرچ ڕۆمانێك يان نۆڤێلە يان كورتە چيرۆكيش لە كونە ديوارەوە نەهاتونەتە دەرەوە. بەدڵنياييەوە دەبێت خاوەنی ڕابردوويەكبن، خراپ يان باش، كورت يان درێژ.. كاراكتەر لە ژێر سێبەری ڕابردويدا دەناسرێتەوە يان باشترە بڵێين، كاراكتەر پرۆدۆكتی يان بەرهەمی چواردەوری يان ڕابردوويەتی، هەر بۆيە تۆمار كردنی مێژووی كاراكتەر لە ڕۆماندا گرنگە چونكە كاراكتەر دەناسێنێت بە خوێنەر، كە بە كورتە باسێك لەسەر كاراكتەر نمونەيەكی مرۆڤ دەدەيت بە



خوێنەر، ئەوکات کە هەرخوێنەرە و بە شێوەیەك لە شێوەکان خۆی وێنەی دەکات لە خەیاڵی خۆیدا، پیویستە خوێنەر ئەو باوەڕەی لادروست بێت، کە کاراکتەرێکی لەو شێوەیە دەکرێت لە هەرجێیەك لە ژیانی ڕۆژانەیدا پێی بگات و مەحاڵ نەبێت، بۆ نموونە لە کاراکتەری ناو کتێبە فەنتازیاکان نەچن کە لەم هەسارەیەی ئێمەدا بونیان نەبێت... هەرچەندە لە کورتە چیرۆکدا نوسەر ئەو بوارەی نییە کە تەنانەت بەشێکیش لە مێژووی کاراکتەر نیشانی خوێنەری بدات، بەڵام خوڵقاندنی وێنەیەك کە خوێنەر بزانێت بێجگە لە پلۆت لەگەڵ کێ پەیوەندی لە خەیاڵیدا ڕابخات، زۆر گرنگە.

دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە نووسینی مێژووی یان پاشبنەمای کاراکتەر، زۆرکات مەبەستێکی تایبەتی نوسەری لە پشتەوەیە، ئەویش مافی نووسەرە و پێویست ناکات نوسەر هەموو پاروەکان بجوێت بۆ خوێنەر، بەتایبەتی لە نوسینی ڕۆماندا، گرنگە خوێنەر خۆی لەکاتی خوێندنەوەی ڕۆماندا، پرسیاری لادروست بێت و بکەوێتە حاڵەتی بیرکردنەوەوە، زۆر جار لە ڕۆمانە مێژوییەکاندا بەپێچەوانەوە کارئاسانییە بۆ خوێنەر و ئیزافە دەکاتە سەر وێنەی کاراکتەر بۆ خوێنەر، لە هەمانکاتیشدا بۆ تۆکمەکردن و بەپێز کردنی "پلۆت"یش گرنگە.

لەناساندنی کاراکتەردا، بە پێویستی دەزانم کە چەند دێڕێك بە نمونە بێنمەوە لە "ژنێك بەسەر منارەوە، شێرزاد حەسەن، لاپەڕە22 دێڕی حەڤدە"دا کە چۆن نوسەر ئەم کاراکتەرەمان بۆ وێنەدەکات، کە بە کورتی و کوردی ڕۆحی دەکات بەبەردا: کە هۆمەر هات هەر هەموو کەس و کار بەمناڵ و مەزنەوە لە بەری هەستان، مشکی و جەمەدانی تێکەڵی، مرادخانی بەری، پێڵاوە تازە بۆیاخ کراوەکانی بریقەیان لە چاوان دەدزی، سمێڵی پڕی کە لە ژێرەوە بۆیەکەی کاڵ ببۆوە سەرنجی ڕاکێشای، تەزبێحی سەوز و قل گەورۆنە و کارەبایی ناو دەستە گەورۆنەکانی، نیگای هەوەسباز و چاوگێڕانی پڕ بە دڵی بە قەدوباڵای تۆدا لە نیگای ئەو ڕاوچیانە دەچوو کە پەنجە دەخەنە سەر پەلەپیتکەی تفەنگ و تاپڕ



و ساچمەزەنەکانیان و بۆ تەماعی پێکانی کۆترە شینکەیەك یان کارمامزێك، چاویان پڕدەبێت لە خوێن، چاوەکانی وەها سوربوون کە سپێنەی لە ڕەشێنەی جیا نەکرێنەوە"، نووسەر لەسەر ئەم کاراکتەرە زیاتر دەنوسێتو بۆ زیاتر خوێندنەوەی "ژنێك بەسەر منارەوە/ شێرزاد حەسەن/ ساڵی **2011**".

زۆرێك لە ڕۆمان نووسەکان، کاراکتەری ناو ڕۆمانەکانیان، لە خاڵێك لە خاڵەکاندا دەچنەوە سەر خۆیان، بە جۆرێك کە زۆر ڕۆمان هەن لە بیۆگرفیای نوسەر خۆی دەچن، چونکە نووسەر زۆر جار لاشعوریانە تەنها نمونەی خۆی لەپێشچاودایە و زیاتر وێنەی خۆی و ڕابردوی خۆی دێنێتەوە پێش چاوی خۆیو تاووتوێی دەکات... بە تایبەتی لەکاتی نوسین و بیرکردنەوەیدا، ئەگەر ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا لە شوێنی کار و لە ماڵ و شوێنە گشتییەکاندا، ئەگەر ئێمە وەك نووسەرێك لەناو هاوڕێ و کەسوکارماندا سەرنج بدەین، دەبینین دەیان و سەدان کاراکتەری زیندو هەن، ئێمەی نوسەر دەتوانین ڕۆژانە بەرچنێك ببەستین و لە پارچە و پێداویستی بگەڕێین بۆ دروست کردن و خوڵقاندنی کاراکتەری ناو ڕۆمان و چیرۆك و شیعرەکانمان، لە شێوازی چاوو دەم و لوتەوە تاکو ڕەفتار و شێوازی لێدوان و ...هتد، دەبێت ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە ڕۆحی نووسەر بێوچان بە بەردەوام لە کاردایە، نەك تەنها لە کاتی بەواتا تەقلیدییەکەی "بیرکردنەوە لە داهێنان"دا، بەڵکو لە هەموو ساتەکانی ژیانی ڕۆژانەیدا و بگرە لە کاتێکدا کە نوسەر بە لاشە نوستووە، ڕۆحی ئەو لە گەڕان و کار و داهێناندایە بە تایبەتی لەو پرۆژەیەی یان "داهێنان"ەی کە لە ئێستایدا نووسەری سەقاڵکردوە.

زۆرێك لە نووسەران لە نوسینەکانیاندا دەربارەی هونەری ڕۆمان، بەتایبەتی لەسەر خوڵقاندنی کاراکتەر، ڕایان وایە کە نوسەری ڕۆمان پێویستە، پێش بەچاپ گەیاندنی ڕۆمانەکەی، یەك یەك کاراکتەری نێو ڕۆمانەکەی بانگهێشت کات و کاتێك لەگەڵیاندا بدوێت و بنوێت و لەگەڵیاندا بخوات و بخواتەوە و گەر جنسی بەرانبەریش بوون خۆشیبوێن و ماچیان کات و سێکسیان لەگەڵدا بکات، پێویستە نووسەر وەکو چۆن خۆی دەناسێت ئاوهاش کاراکتەرەکانیشی بناسێ، چۆن ڕەفتار دەنوێنن، چۆن دەجوڵێنەوە، بزێون یان سست و لاواز، درێژن یان کورت، قەڵەو یان لاواز، چۆن سەرنجی چواردەوریان دەدەن، شێوەی وەستانیان چۆنە، چۆن قسەدەکەن، بەدەنگی بەرز یان دەنگیان گڕ یان زیقنن، حەزیان لە چی ڕەنگێکە، ئەمانە هەموو بۆ تۆمارکردنیان لە وەسفی کاراکتەرداو



گواستنەوەیان لە خەیاڵەوە بۆ نووسین گرنگن، بۆ تۆمارکردنیان نووسەر تەنها پێویستی بەو کەرەسەیەیە کە ئەویش زمانە.

لە هەمانکاتدا ڕۆماننووس دەبێت لە گەشەکردن و گەورەبوون و پیربوونی کاراکتەردا ئاگاداربێت، مەبەستمە کە نوسەر ئاگاداری کات بێت، هەموو ئەوەدەزانین کە ئێمەی مرۆڤ لە سەر هەسارەیەك دەژین کە هیچ شتێك تێیدا درووست نەبووە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە، کەئەویش پەیوەندی بە کاتەوە هەیە کە هەموو شتێك کۆن یان پیر دەبێت و گۆڕانکاری بەسەردا دێت، نەك تەنها کاراکتەر بەڵکو هەموو شوێن و فیگورێکیش لە ڕۆماندا لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا، بە گوێرەی پێویست گۆڕانکاری بەسەردا بێت.

گرنگە ڕۆماننووس ئاگاداربێت، ئەگەر زەمەنی گێڕانەوەی ڕۆمان درێژی تەمەنی کەسێك بێت، یان بگرە لە ساڵێك زیاتر بێت، ئەوە دەبێت زۆر ئاگاداری گۆڕانکارییەکان بێت، گۆڕانکاری لە کۆی کاراکتەرەکانی ناو ڕۆماندا، بەتایبەتی کاراکتەری سەرەکیو گۆڕانکاری لە شوێنیشدا بەهەمان شیوە پێویستە.

## کاراکتەری لاوەکی

زۆر لە ڕۆماننووسەکان زۆر سادەوساکار کاراکتەری لاوەکی دەخولقێنن و بەشداریان پێدەکەن یان ڕۆڵیان پێدەدەن، زۆر جار خولقینراون لە پێناو کاراکتەری سەرەکیدا یان وەك داشێك دەجوڵێندرێن بۆ تەواو کردنی "پلۆت" کە ئەوەش تەنها ئیختیاری نووسەرە، چونکە نووسینی چیرۆك یان ڕۆمان ماتماتیك نییە کە بڵێین یەك کۆی یەك دەکاتە دوو، بە پێچەوانەوە....

کاراکتەری لاوەکی، زۆرجار کاراکتەری لاوازو سادەیە و "پلات کاراکتەر"ە، کە زۆر جار لەوە زیاتر پێویست ناکات، یان بابڵێین کە لە زۆر ڕۆماندا ڕۆڵی کاراکتەری لاوەکی ئەوەندە کورت و بەرتەسکە کە هەر ئەوەندەیان قابیلە، بەڵام ئەوەش دەکەوێتە سەر ڕۆڵی ئەو کاراکتەرە، تەنها ناو پێویستە زۆرجار بۆ کاراکتەری لاوەکی، ئەویش دەکەوێتە سەر درێژی و کورتی ڕۆڵی کاراکتەر.

بێجگە لە کاراکتەری سەرەکی، بۆ خوێنەر



پێویستە کە کاراکتەری تر لە ئامادابن تاکو خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەدا ئیختیاری هەبێت، ئەگەر هاتو خوێنەر بە ڕەفتار و شێوازی کاراکتەری سەرەکی سەرسام نەبوو، ئەوکات کاراکتەری لاوەکی یان پلۆت پێویستە خوێنەر پابەند کات بە خوێندنەوەی ڕۆمانەوە.

## کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانێك

ئەگەر ڕۆمانێکمان خوێندەوە کە ڕۆمانەکە باسی ڕۆژ بێت و خوێنەر تامەزرۆی خوێندنەوەشی بێت، باس لە شەڕ یان ئاشتی بکات، یان ڕۆمانی هەرچ ژانرێك بێت، ئەگەر کاراکتەر نەناس بێت، ناتوانێت سەرنجی خوێنەر ڕابکێشیت بۆ باسەکە"پلۆت". من خۆم کاتێك ڕۆمانێك دەخوێنمەوە چەندین پرسیارم لەلا دروست دەبێت هەرچەندە لە منێکی خوێنەرەوە بۆ خوێنەرێکی تر دەگۆڕدرێت بە گوێرەی ئاستی ڕۆشنبیریمان و ئاسۆی خوێندنەوەمان، لە هەمان کاتدا من لەو باوەڕەدام کە بەگشتی زۆرینەی خوێنەری ڕۆمان لە زهنی خۆیاندا هەڵگری کۆمەڵێك پرسیارن بۆ نمونە ئەو پرسیارانەی من لەلام دروست دەبن :

یەکەم : لەگەڵ کاراکتەرەکاندا دەژیم تاکو کۆتایی ڕۆمانەکە، بە تایبەتی کەسی یەکەم "پاڵەوان".

دووەم : هێڵی سەرەکی و گەورەی ناو ڕۆمان تاچەندێك لەبیر نەکراوە، پاشان جەدوەلی زەمەنی گێرانەوەی ڕۆمانەکە، لایەنی سۆزداری چەندێك گرنگی پێدراوە.

سێهەم : شێوازی بەرەوڕوبونەوەی گرژییەکان و بیرۆکەی ڕەواندنەوەیان لە ڕۆماندا.

چوارەم : ناوی ناودار و وتاری فەلسەفی و پەندی پێشینان و قسەی زەرد و سور زۆری تر لەوانە، کە توشیان دەبین لە ڕۆماندا، کە من خۆم بەراوردیان دەکەم لەگەڵ، بۆ نموونە کاتێك لە لای دوکاندارێك بمەوێت بنێشتی کوردی بکڕم، بەڵام دوکاندار ڕامگرێت و بیەوێت هەموو کەرەسەکانی تری دوکانەکەیم بەسەردا ساخبکاتەوە، هەر بۆیە ئەم نمونەیە چونکە زۆرجار بوون یان نەبوونی ئەم زیادکراوانە هیچ لە ناوەڕۆکی ڕۆمانەکە ناگۆڕێت، من وەکو خوێنەر چاوەڕوانی ناکەم و مەبەستی من لە خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە ئەوەنییە کە گوێ بیستی ئەو وشە و ڕستە و وتارە لاوەکیانەبم وەکو خوێنەر!

ئەم زیادکاریانەش لە کاتێکدا دێن کە کاراکتەری قسەکەر یان گێڕەرەوە لە لایەن خودی نووسەر خۆیەوە داگیر دەکرێت یان بەکار دەهێنرێت بۆ مەبەست و خواستی نوسەرەکە خۆی و بۆ تۆمارکردنی وتاری نووسەر، بۆ



نموونە زۆرجار لە ڕۆمانە کوردییەکاندا هەستیان پێدەکەین، کە لێدوانی زۆرێك لە کاراکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکان لە وتار و لێدوانی ڕۆژانەی نووسەرەکانیاندا دەبینرێن کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاویان دەکەنەوە!

پێنجەم : وشەی دووبارە لە فەسڵێکدا یان لاپەڕەیەکدا.

شەشەم : وەسف کردن یان نمایشکردنی وێنەی تەواو بە نوسین، نەوەك "جوان بوو، ناشیرین بوو، بێزاری پێوەدیاربوو، تووڕە بوو ...هتد"، هەروەك لە کڵتووری نووسیندا وتەیەك هەیە لە جیهاندا زۆر گوێمان لێدەبێت "شۆ دۆنت تێڵ".

چیرۆکی باش بە بێ گرنگیدان بە کاراکتەر ئەستەمە، کە ئەمەش گرنگە لە کاری ڕۆژنامەگەریشدا، کە لە هەر ڕێپۆرتاژێکدا کە ڕۆژنامەنوسێك ئامادەی دەکات، لە سەرەتادا بێت یان کۆتایی، بەدەنگی بێت یان بە ڕەنگی کارکتەرێکی پێویستە.

بۆ نموونە: کە ڕۆژنامەنووسێك ڕێپۆرتاژێك ئامادە دەکات بۆ کەناڵێکی تەلەفزیۆن لە سەر تەقینەوەی گڕکانێك، گرنگی و تایبەتمەندی خۆی دەبێت بۆ بینەر، کە خۆی ڕۆژنامەوان شایەتحاڵی کاتی تەقینەوەی گڕکانەکەبێت، کە بینەر ببینێت کە کاراکتەری ڕۆژنامەنوسەکە خۆیەتی و چەندێکیش سەرسامە بە ڕوداوەکە، کە لەم کاتەدا بینەر خۆی لە جەستەی کاراکتەردا دەبینێتەوە کە ڕۆژنامەنوسەکەیە و هەست دەکات کە خۆی ئامادەیی هەیە لە کاتی تەقینی گڕکانەکەدا.

زۆرجار پرسیاری ئەوە دەکرێت کە لە ڕۆماندا، کاراکتەر گرنگترە لە "پلۆت"؟

هیچ وەڵامێکی ڕاستەوخۆ نییە بۆ ئەم پرسیارە، چونکە هەموو کات دەکەوێتە سەر خواست و هەڵبژاردنی نووسەر، هەروەك چۆن نووسەری ڕۆمان مەبەستی بێت و بە پێویستی بزانێت، چونکە نووسەر دەنوسێت چی بەسەر کاراکتەر دێت و چی ئاستەنگێك چاوەڕوانیەتی، لەکوێی ژیاندا وەستاوە و چۆن لە جیهان دەڕوانێت، کە لەم کاتەدا کاراکتەر دەبێتە سەبەبی درووست بوونی ڕوداوەکان.

نووسەری لێهاتوو ڕوداوەکان دەخوڵقێنێت تاکو لێهاتوویی یان لاوازی کاراکتەرمان نیشان بدات.

ئەوەی لە ڕۆماندا پێویستە بۆ خوێنەر بۆ ناسینی



کاراکتەر دیالۆگە، کە هەموو کاراکتەری ناو ڕۆمانەکە پێویستە بەختیان بدرێتی بۆ ئەوەی هەر کاراکتەرە بە دەنگ و ڕەنگی خۆی نمایش بکات، ئەوکات کار ئاسانیش دەبێت بۆ خوێنەر بۆ ناسینی کاراکتەرەکانی ناو هەر ڕۆمانێك.

## خوێنەر

پێویستە خوێنەر وێنەی تەواوی کاراکتەری بدرێتێ بە نووسین، بۆ نموونە کاتێك نووسەر دەڵێت "باپیرەم پیاوێکی باش بوو" کە خوێنەر لەم کاراکتەرە کە باپیرەیە، لە وشەی باش بوو، دەبێت خوێنەر خۆی لە وشەی باش کە دەدرێتە پاڵ باپیرە بۆ وێنەی ڕەفتاری یان کەسێتی باپیرە بگەڕێت، لە ڕوانگەی ئەم ووشەیەوە دەبیت خوێنەر وێنەیەکی باپیرە لە خەیاڵی خۆیدا بخولقێنێت. بەڵام ئەگەر بە نووسین وێنەی وشەی باش تۆمار بکرێت لەلایەن نوسەرەوە بۆ خوێنەر بۆ نموونە:
"لەگەڵ باپیرەم زۆر کات وێنەمان دەکێشا و فێری دەکردم کە چۆن ڕەنگەکان تێکەڵ کەم و فڵچەکە بگرم، شەوانیش پێش نوستنم سەرسامی دەکردم بە چیرۆکێك لەو چیرۆکانەی کە لە خەیاڵیدا هەڵی گرتبوون."
بەم دوو دێڕە نووسەر وێنەیەکی تر دەدات بە خوێنەر لە سەر ئەو کاراکتەرە کە باپیرەیە.
یان نووسینی "باپیرم پیاوێکی خراپ بوو"، بە هەمان شێوە، نووسەر دەبێت ئاگادار بێت کە وشەی"باش بوو، خراپ بوو، ناشیرین بوو، جوان بوو، خەمبار، بێزار، عاشق بوو.... هتد" کە وێنەی پێویست نادەن بە خوێنەر، کە نووسینی پڕ وێنە بڕبڕەی پشتی زمانی گێڕانەوەیە، بەتایبەتی لە ڕۆماندا، من پێم وایە ئەو ڕۆماننوسانەی کە نووسینیان پڕن لەم وشانە، ئەوە لە بواری نووسینی ڕۆماندا کورتیان هێناوە.
خولقاندنی وێنەی تەواوی کاراکتەر گرنگە بۆ خوینەر، بە تایبەتی لە کاتی روداوەکاندا خوێنەر لە ڕێگەی کاراکتەری وێنەکراوەوە بە جیهانی ڕۆمانەکەوە پابەند دەکەیت بە خوێندنەوەوە، ئەمەش مەبەستی هەموو نوسەرێکە کە ڕۆمانەکەی لە سەرەتا تاکو کۆتایی لە لایەن خوێنەرەوە بخوێنرێتەوە، بەڵام زۆرجار بە پێچەوانەوە دوای چەندین لاپەڕە خوێنەر سەرسام نابێت بە جیهانی خولقێندراوی ناو ڕۆمان و ئەم جیهانە بەجێدێڵێت و بەختیش زۆرە کە جارێکیتر ئەو خوێنەرە بۆ ئەم جیهانە نەگەڕێتەوە، پاشان لای هاوڕێ و دۆستانی خۆیشی بە جیهانێکی دڵگیر لە قەڵەمی نادات.








لەم کاتەدا پێویستە کە نووسەر ئاگادار بێت لەوەی لاپەڕەی یەکەم یان فەسڵی یەکەمی ڕۆمان زۆر گرنگە، بۆ نموونە، دەرخستنی چەند سەرەداوێك و ناساندنی کاراکتەری یەکەم پێویستە، خولٚقاندن و ناساندنی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش، تاکو خوێنەر سەرسامبن بە ڕەوشتی یان شیوازی قسەکردنی، یان بۆ نمونە جنسی کاراکتەر، مەبەست لەم چەند دێڕە جۆرێکە لە دان ڕۆکردن بۆ خوێنەر تاکو زیاتر بێتە ناو باسی ڕۆمانەکەوە، هەر جەندە زۆرێك لە نووسەران پێیان وایە کە ئەوان لەکاتێکدا دەست دەکەن بە نووسینی ڕۆمانێك قەت خوێنەریان لە خەیاڵدا نییە، بەڵکو تاکو تەواو بوونیش، بەلاّم دەبێت ئەوە بزانین کە پاشان نووسین و ڕۆمانە کانمان هەر دێنەوە بەردەستی خوێنەرو ئەوان دەبنە تەواوکەریان..



# چ گوڵستانێك بوو.. كتێب..!

نووسینی: شێرزاد حەسەن

ئەو ڕۆژەم لە یادە کە بۆ یەکەمین جار مامۆستا " تەحسین" ئێمەی ڕاپێچا بۆ کتێبخانەی هەولێر کە گەورەترین و تاقانە بوو لەو رۆژگارەدا، وشەی "ڕاپێچان" مانا شاراوەکەی ئەوەیە کە کارێکە بە زۆر پێمانی دەکەن، چونکە ژمارەیەکی زۆرمان گومانیان بوو لەوەی ئەم گەشتە خۆشییەکی گەورەی تێدا بێت بۆ ئێمە کە کتێبەکانی مەکتەب لە تەڵە و فاقە و تەپکە و داو و ئامرازی سزا دەچوون، بێجگە لە خەم و ماندوێتی و ئازار هیچی دیکەمان لێیان چنگ نەدەکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا من و ژمارەیەك لە هاپۆلەکانم پێمان خۆش بوو ڕێکەوتێکی وا دروست بێت کە وەك بەشێك لە چالاکی پەیوەست بە قوتابخانەوە بمانبەنە دەرەوەی دیوارە ئەستوورەکانی مەکتەب کە پتر هەستی بەندیخانەی بە هەمووومان دەبەخشی، هەتا گەر ئەو چوونە دەرەوەیە بۆ قەسابخانەش بێت هەر خۆشە و هەوا گۆڕین بوو، ئەو مامۆستایە لە قۆناغی ناوەندی ـ دا وانەی عەرەبی پێدەوتین ، هێمن و دوور بوو لەوەی بە زەبر

و زەنگ پەروەردەمان بکات یان فێرمان بکات، گەر زۆر توورە بووایە لە شتێك سوور هەڵدەگەڕا و سەری کەپووی ئارەقەی دەکرد و چاوەکانی پڕ دەبوون لە ئاو کە من پتر بە گریانێکی پەنهانم دەزانی و مەزەندەم دەکرد ئەو تنۆکە گیرخواردووانەی نێوان پێڵووەکانی دڵۆپی فرمێسك بن، خۆی دەخواردەوە و خامۆش دەبوو، جار هەبوو بە درێژایی وانەکە خامۆشی دەیبرد کە ئەوەش بۆ خۆی زۆر دەگمەن بوو.

هەرگیز لە یادم ناچێت کە لە پای نووسینی دارِشتنێکی من بە عەرەبی هانی دام بە بەر چاوی هەموو هاپۆلەکانمەوە بیخوێنمەوە، ئەوەش کەمەکێ شاگەشکەی کردم کە منی شرۆڵ مامۆستاکەم بایی ئەوەندە سەرسام کردووە کە گەرەکییەتی هەموو پۆلەکە هەمان چێژی مامۆستا کە دیوییەتی لەو دارِشتنەم، ئەوانیدیکەش ببینن و بمکات بە مۆدێلێك بۆ هەموویان تا سایلی من هەوڵبدەن جوانتر بنووسن، شاگەشکەتر بووم کە چەند رۆژێك دواتر گۆڤارێکی ئەدەبی عەرەبی بۆ هێنام پڕ لە شیعر و چیرۆك و پەخشان و شیکاری ئەدەبی کە بووە مایەی داواکاری زیاتری من بۆ ئەم جۆرە گۆڤارە یان هاوشێوەی وەها غەزەتەیەك.

وا مەزەندەش دەکەم بۆ ئەوەی مەراقم گەرمتر بکات ئاشنای کردم بە کتێبخانە هەژارەکەی قوتابخانەکەی خۆمان، کە تۆز و پیسیی کتێبەکانی داپۆشی بوو وەك هەمیشە، کە دواتر بۆ ماوەی سی و شەش ساڵی کارکردنم لە بواری پەروەردەدا بە سەدەها مەکتەبم بینی کە کتێبخانەکانی نوقمی تۆز و خامۆشی بوون، سەدەهاشم بینی بێ کتێبخانە.

من توانیم هەر مانگەو یەك دوو کتێب بە ئاگاداری مامۆستاکەم وەربگرم و حونجەیان بکەم، دیارە لە هەموو مەکتەبەکە ژمارەیەکی کەم لە قوتابیان هەمان حەوسەڵەیان هەبوو، پێنج ـ شەش کەسێك بووین و بڕیارمان دا کە کتێبخانەکە لە تۆز و خۆڵ پاك بکەینەوە و گەر بەرگیان دڕاو و هەلاهەلا بن، بە حەزەوە پینەیان بکەین و بەرگی دیکەیان تێبگرین.. کردمان و بۆ ئێمە ئاهەنگ بوو. گۆڤارەکانی مامۆستاکەم دیاری بوون، کتێبەکان بردن و هێنانەوەیان بە



وەخت و بەرنامە بوو.

یەکەمین سەرسامی هەرە دڵخۆشکەرەی من لە ناو کتێبخانە تاقانەکەی شاردا لەوەدا کۆتایی نەدەهات کە هەزارەها کتێبی دیکەم بینی کە وەك لالەزار و گوڵستان دەهاتنە بەرچاوم، جیاواز لەو کتێبە وشك و بێ تامانەی خۆمان، ناونیشانی جیاواز، ڕەنگ و بەرگ و بۆن و وێنەی جیاواز. بەناو ڕاڕەوەکان و ڕەفەکاندا پیاسەم دەکرد و بۆنێکی تازە و خۆش بە کەللەم دەیتاساندم، هاوکات دەمبینی کە ئەوانیش لە ژێر بارستایی تۆز و خۆڵێکی ئەستوورتر خەوتوون، وام هەست دەکرد کە بە گران هەناسە بدەن، بانگیان دەکردم کە بیانگرمە ئامێزم تاوەکو هەست بکەن زیندوون و خۆشەویستن، بێ درۆ لەوەش دەترسام کە ئاخۆ بایی چەند ڕەوایە ئەم کتێبانەش ببەینەوە ماڵەوە تاوەکو خۆمانی پێ ئاوەدان و سەرمەست بکەین؟

ڕاستییە تاڵەکە ئەوە بوو کە من تا هەنووکەش ژمارەیەکی یەکجار زۆرم لە کتێبی فەرامۆشکراو و تۆز لێنیشتووی سەر ڕەفە و تاقەکان و ناو چەکمەجەکاندا بینی، لە ناو باوڵ و گوێنی، لە عەمبار و گەنجینەی دەرگا لەسەر داخراوەکان، کتێب لای ئێمە هەرگیز نموود و ڕێزی ئەوتۆی نەبووە، بەڵکو وەك هەر کوتاڵێکی عەمبارەپۆ بێسوود تەماشا کراوە.. زۆر جاریش شایەستەی فڕێدان و سووتان بووە، کتێب لە چاوی خەڵکی ئێمە بۆ هەمیشە بوونێکی ترسناك بووە.. وەك ڕاوگەی شەیتان چاوی لێکراوە. ترسناکترین دیمەن لای گەورەکان، بە تایبەتی دایکان و باوکان ئەوەیە کچەکانیان یان کوڕەکانیان لە ژوورێکدا بە تەنیا سەر بەسەر کتێبێکدا شۆڕ بکەنەوە و بێئاگا بن لە دونیای دەرەوە، هەتا ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستاکان و بگرە خەڵکی خوێندەوار لەوە دەترسن منداڵەکانیان کتێبی غەیری پرۆگرامی ڕێگەپێدراو لە قوتابخانەکان بخوێننەوە. سەرنج بدە بە پێچەوانەوەی دونیای دەرەوەی ئێمە کە لە ناو پاس و میترۆ و شەمەندەفەر و پارك و باخچەکان و کافێ و باڕەکانیش دەخوێننەوە، لای خۆمان دیاردەی وا زۆر دەگمەنە یان هەر نییە.

هەر دوای سەردانمان بۆ کتێبخانەی گشتی لە هەولێر، بە چرپە و ترسەوە ڕازی دڵی خۆم لای مامۆستا درکاند، ئەویش ڕێنمایی کردین کە هەر یەکێك لە ئێمە بۆی هەیە بە ناسنامەکەی مەکتەب یان یەکێکی تازەی کتێبخانەکە کە بۆمانی دەردەکەن، بۆمان دەلوێت ببینە میوانی هەمیشەیی ئەو لالەزارە، یان بە قەرز بردنی کتێبەکان بۆ ماڵەوە.. کەم هەواڵی لەو ساتەوەختەدا وەها منی خرۆشاند و سەرمەستی کردم.. منی بێ پووڵ کە مەحاڵ بوو بتوانم لەسەر گیرفانی خۆم



ببم بە خاوەنی تاقە یەك كتێبیش.
من سكم بەو كتێبانە دەسووتا و هاوسۆزیان بووم لەوەدا كە رێك وەك منی گەنج فەرامۆشكراون، پڕ پەند و گفت و راز و هەقایەتی جوان و سەراسیمەن، كەچی كەس نایانبینێت، پڕ جۆش و خرۆشن .. وەلێ مایەپووچ وەك من..!
تاوەكو كەسێك بە میهر و سۆزەوە نەیەت و لاپەڕە بە لاپەڕە سەیریان نەكات، بە چاو و دڵ و رۆح خۆی نەخاتە ناو ئەو زەریای مەرەكەبە وشكەوەبووەی سەر كاغەزەكان.. مەحاڵە هەست بكەن زیندوون. ئاخر هەموو كتێبێك لەوێدا مردووە تا ئەو ساتەی كەسێك دەستی بۆ دەبات .. ئەوسا چاو هەڵدێنێت و زیندوو دەبێتەوە.. وای لە بۆنی سەنگین وخۆشی ئەو لق و پۆپ و گەڵایانەی كە هەنووكە ببوون بە كاغەز و كەچی بۆنی دارستان و جەنگەڵەكانی شاد و حەیرانی دەكردم. چیرۆك و رۆمانەكانی سەر ڕەفەكانیش وەك من پڕ خەیاڵ و پاڵەوان و گرێچن و ململانێ و سەرەتاو كۆتایی و تانوپۆ بوون.. كەچی ژمارەیەكی كەم دەهاتن بۆ بێدار كردنەوەیان.. یان هەندێك رۆژ هیچ كەس نەدەهات.. ئەفسووس كە وەك من تەنیا و غەریب بوون.. وەك من پەڕپووت و نابووت.
هاپۆلەكانم هاندا كە پتر بمێنینەوە و پەلە نەكەین، هەڵبەت هەبوو ڕقی لە هەموو كتێبەكانی دونیا دەبۆوە و " حامورابی" بە نەفرەت دەكرد كە گوایە یەكەمین كەس بووە بەردی بناغەی مەكتەبی داناوە.. دەیانوت: گوو بە گۆڕەكەی..!
قوتابخانە بۆ خۆی یەكەمین مەڵبەندی تۆرانی ئێمەیە لە كتێب و خوێندنەوە، قوتابیان كە دوا جار زانكۆ تەواو دەكەن، ژمارە هەر زۆرەكەی، خەونی ئەوەی هەیە كە بۆ هەتا هەتایە كتێب تەلاق بدات.
باوەجوو.. هەقیان بوو كە قوتابخانە پتر لە زیندان و سزاخانە دەچوو، لەسەر نەزانینی ناوی شاخ و رووبارێك و بەرواری جەنگێك و لە یادكردنی ئایەتێك و دێڕە شیعرێك جەهەننەمیان پێ پیشان دەدراین.. راستی پتر لە قەسابخانە دەچوو تاوەكو كانگای زانست و هونەر و زمان و مرۆڤناسی.. هەنووكەش هەر وایە..
من بۆ خۆم لە یەك دوو ماڵی دیكەی خزم و دەرو



دراوسێ چەند کتێبێکم بینی: میعراجنامە.. ئەمیر ئەرسەلان.. رۆستەم و زۆراب.. یوسف و زلێخا.. شیرین و فەرهاد.. شێخی سەنعان.. شەبەکە و مەوعید.. تەبیبوکەی سەبری قەببانی.. رۆمانەکانی موستەفا لوتفی مەنفەلووتی.. چەند کتێبێکی قاچاغی مارکس و لینین کە بە ریشە پڕەکەی مارکس و سەری رووتاوی لینین لە یەکدیم جیا دەکردنەوە.. هەڵبەت قورئانیش کە من بۆ خۆم لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە خەتمم کردبوو.. لە هەموو ماڵێکدا لە بان سەر بوو.. کە ئەوەش یارمەتی دام زووتر ترسم لەو زمانە بشکێت و پێڕەوگە ئاسا و دارە دارە فێری ببم.. لەوە زیاتر نەبوو، راستی گەڕەکی ئێمە کە مەڵبەندی هەژاران و نەخوێندەواران بوو.. دەکرا مرۆ بێ کتێب بژی و خەمێکی ئەوتۆشی نەبێت کە لە شتێکی کەمە.

درەنگتر زانیم.. کە گەورەتر بووم زانیم کە خانەوادە دەوڵەمەندەکانیش بۆ دیکۆر و ماڵ رازاندنەوە لە تەك شتە عەنتیکەکانی دیکەدا کتێبیش کۆ دەکەنەوە، ئەوەش بۆ خۆی جۆرێك بوو لە خۆنواندن و لاف و گەزاف.

بۆ منێکی پەڕپووتیش کتێبەکان پەناگا و خۆشاردنەوە بوو لە هەمووان.. گەشتێکیش رووەو خۆ دۆزینەوە و خوانێکی رازاوەی دەوڵەمەند بە جۆرەها میوەی رۆح.. لە هەمووی جوانتر دڵدانەوەیەکی هەمیشەیی بوو لە نێو جەهەننەمی ئەو هەموو کارەسات و نشوستی و شکستە کەمەرشکێنەکان.

هاوینی ـ **2013**





# شیعر و مانا

ئەحمەدی مەلا

دەسپێك

کاتێك ئێمە باس لە مانای شیعر دەکەین، مەبەستمان چ مانایەکە و چۆنیش ئەو مانایە دروست دەبێت؟ خودی مانا چییە و لە پێناو چیدا دروست دەبێت؟ سەرەتا با وەڵامی دووەمیان بدەینەوە، ئینجا دەچینە سەر پرسە گرینگەکە کە مەبەستی ئێمەیە لەم لێکۆڵینەوە کورتە. مانا بە گشتی دەکرێ

لە پێنج خاڵدا پێناسە بکرێت :
یەکەم: یەکێك لە ئەرکە سایکۆلۆژییەکانە کە لە ڕێگایەوە ئۆرگانیزمێك چەند زانیارییەکمان لە دونیای دەرەوەوە پێدەگات، رەنگە سروشتی فیزیاییان هەبێت وەك (بینین، هەستکردن بە کێش، دەستلێدان) یا سروشتی کیمیاییان هەبێت وەك "بۆن و تام".
دووەم: ئەو توانایە کە بە شێوەیەکی کتوپڕ و لە ڕێگای نەستەوە(ئینتوسیۆن) شتێك هەڵبسەنگێنێ: هەستکردن بە وردەکاری "نویانس".
سێیەم: سەرجەمی ئەو بیرۆکانەی کە لە ڕێگای هێمایەکەوە، یا رەمزێکەوە دەگاتە لامان. نموونەی ڕستەیەك یان هێمای سەر جادەوبانەکان.
چوارەم: گەڕان بە دوای مانای وشەیەکی دیاریکراو لە فەرهەنگی زماندا.
پێنجەم: واتای بوون، بەها، ئامانجی شتێکی دیاریکراو، ئەوەی پاساو و لێکدانەوە هەڵدەگرێ. نموونەی مانادان بە بوون.
کەواتە دەسپێك، ناکرێ مانا لە گەڵ هەست و ئەتمۆسفێر و رەگەزە ئێستێتیك و جوانییەکان تێکەڵ بکرێت.(کانییەکی روونی بەر تریفەی مانگەشەو) هیچ مانایەکی دیاریکراومان ناداتێ، بەڵکو وێناکردنی سروشتە لە ڕێگای زمانەوە و جوانکردن و بەهابەخشینە بەو جوانییە. بەڵام کاتێك شیعرەکە تەواو دەکەین، هەڵەیە کورتی بکەینەوە سەر ئەو مانایەی کە بڵێن گۆران ویستویەتی سروشتی کوردستان لە سروشتی ئەو وڵاتانەی کە زەریایان هەیە، بەرزتر بنرخێنێ. ئەگەر ئەمە پەیامەکە بێت، خۆ دەکرا بە ڕستەیەك کۆتایی پێ بهاتبایە. بەڵکو گرینگی شیعرەکە لە داڕشتنەکەیەتی. کەواتە جوانیی ومانا دوو شتی جیاوازن ؛ بە پێچەوانەشەوە، کاتێك باس لە مانا دەکرێت، واتە دەستبەسەرگرتن، چوارچێوەرێژکردن، تەنانەت دیاریکردن. هزر هەڵدەستێ بەم کارانە. ئەمەش هەڵبەتە بەشێکی هەرە زۆری لە ڕێگای زمانەوە دێنە دی، رەنگە هەندێجار "زمانی هێما" مانایەك ببەخشێتە شتێکی دیاریکراو. کاتێکیش باس لە زمان دەکرێت، واتە باس لە سیستەمێکی دیاریکراو دەکرێت کە کاری ڕێکخستن و هەڵسوڕانی زمانەکە دەگرێتە ئەستۆ. هەر زمانێکیش بە پێی تایبەتمەندییەکانی خۆی سیستەمەکەی خۆی ڕێکدەخات.
کاتێك بە هەموو شێوەیەك هەوڵدەدرێت شیعرەکەی نالی (ئەوەی لە شامەوە دەینووسێ) کورتبکرێتەوە بۆ گوزارشتکردن لە چەمکی نوستالژی و دەربڕینی هەستی





نەتەوایەتی نالی بۆ نیشتیمان و زێدی خۆی، ئەوە هەوڵدانە بۆ کوشتنی خودی شیعرەکە، چونکە ئەوە ئێمەین هەوڵدەدەین و دەمانەوێ کە مەبەستی نالی ئەوە بووبێت، نەك خودی نالی. ئەم جیاکردنەوەی مانایە لە شیکلی دەقە شیعرییەکە بە کوشتنی شیعرەکە کۆتایی دێت.

سیستەمی زمانی شیعری

کاتێك باس لە شیعر دەکرێت، باس لە سەقامگیربوونی سیستەمێکی دیکەی زمان دەکرێت. سیستەمێکی سەربەخۆیە و بە شێوەیەکی جوداواز هەڵدەستێ بە ڕێکخستنەوەی تەونی ماناکان. لە هۆنراوەدا دەچینە نێو شیکلێکی نۆرماتیف و کۆدگیرەوە (کێش، سەروا، بابەت هتد) و کاتێکیش باس لە شیعری سەربەست دەکرێت ئەوە شیکلێکی "چاوەڕوانکراو" کارەکان بەڕێوە دەبات. واتە هەموو کردەیەکی شیعریی بۆی هەیە، دەنگێك، ڕەگەزێکی چاوەڕواننەکراو بهێنێتە نێو دەقێکەوە.

شیعر گواستنەوەی نیزامێکی عەقڵانی و گوتارئامێزە (دیسکورسیف)ەوە بۆ نیزامێك کە هەست و سۆز و جۆش و خروشی تیایە سەروەری دەکات. واتە ئیش لەسەر زمانی گشتی دەکات و دەیباتە بوارێکی تایبەتەوە. بە واتایەك لە واتاکان، نیزامی خودی ماناکان لە بوارێکەوە بۆ بۆارێکی دیکە دەگوازێتەوە. لە یەکەمیاندا، ئەم نیزامە کاری پێشنیارکردن و دیاریکردن دەبینێ، لە دووەمیشیاندا کاری وێناکردن "روپرێزانتەیشن"ە کە ئاماژە یەکێکە لە خەسڵەتەکانی ئەم وێناکردنە. ئەم ئاماژپێکردنە لە ڕێگای وێنە و فیگەر و ڕەمزەوە بەرقەرار دەبێت. کاتێك رۆلان پارت باس لە مانا و شیعر دەکات، دەڵێ :" هەوڵدانە بۆ ماناگرتن". واتە نووسینی شیعر و خوێندنەوەی شیعر لە پێناو گواستنەوەی مانایەك نییە لە ڕێگای نووسینەوە، بەڵکو تێکشکاندنی مانایە و هەوڵدانێکە بە گرتنەوە مانایەکی دی کە لە نێو سیستەمێکی تەواو جیاوازدا ئیشدەکات.
بۆ ئەوەی وردتر روونکردنەوەیەك پێشنیار بکەین، کاتێك باس لە زمانی پەخشان دەکەین، بۆ نموونە کاتێ کورتە چیرۆکێك یا رۆمانێك دەخوێنینەوە، دەچینە نێو بەردەوامییەوە:

کرۆنۆلۆژیا، کەسایەتی، کات، فەزا، هێڵی ئاسۆیی لە دامەزراندنی نووسین.(لە راستەوە بۆ چەپ و تا کۆتایی لاپەڕە و ئینجا هاتنە خوارەوە و بەردەوامیی.) کەچی لە شیعردا کات و فەزا لە ناودەچن، واتە لە دەرەوەی چەمکی بەردەوامیداین، وەك چۆن لە پەخشانێکدا هەستی پێدەکەین. بە تێکچوونی ئەم دوو چەمکە، واتە کات و فەزا، ئیدی مانا بە مانا تەقلیدییەکەی نامێنێ. رەنگە شیعر لە پێناو کوشتنی مانای یەکەم بێت، مانای سیاسی، مانای کۆمەڵایەتی، مانای نۆرمەکان.

هەروەها شیعر لێکدان و لێکترنجاندنی فۆنێم و مانایە، واتە ئاوێتەکردنی ئەم دوو چەمکەیە ؛ کەچی لە پەخشاندا ئەم ئاوێتەکردنە زۆر بە دەگمەن دەبینیرێت. کاتێك باس لە فۆنێم دەکەین، مەبەستمان دەنگی پیتە، تەنانەت بێدەنگیش دەکرێ لەم بوارەدا جێی خۆی بکاتەوە. بێدەنگی گەڕانە بە دوای مانایەك کە وجوودی نییە، لە پشتەوەی دەقە، سەدایەکە لە دوورەوە دێ. هەروەها گوێگرتن لە دەنگێ، دەنگی پیتێك بێت یان وشەیەك، یان دووبارەکردنەوەی دەنگ و پیت بێت، گواستنەوەیەکە لە بواری عەقڵەوە بۆ بورای وروژاندن. وروژاندنی شتێك لە رێگای زمانێکی دیاریکراوەوە، ئاراستە و ئاماژەیەکمان پێ نیشان دەدات. شیعر دەست ناخاتە سەر شتەکان، تەنها ئاراستەکانمان بۆ دەدۆزێتەوە. نایەوێت پەیاممان لە بارەی ئازادییەوە بداتێ، بەڵکو ئازادیمان دەداتێ لە خوێندنەوە. ڤالێری ئەم حالەتە بە "بگرە و بەردەیەکی درێژخایەن لە نێوان دەنگ و مانا" ناودەبا. لە شیعردا بەرەو پێشەوەچوون و کشانەوە بەدی دەکەین، کشانەوە لە پێناو دەنگێك، لە پێنا رەگەزێك، تەنانەت لە پێناو بێدەنگییەك..ژاکۆبسۆن پێی دەڵێ " هاوئاوزایی ناوەکی" واتە پرەنسیپی لەیەکچوون (دەنگ، کێش، سەروا، رەگەزی دیکەی شیعری).

"دووفاقەیی"، "نادیار"، "پەنهان" خەسڵەتی بنەڕەتی دەقی شیعرییە، ئەمە خەسڵەتی هەموو دەقێکە کە ئاراستەی چەقی خۆی کرابێت، واتە ئاراستەی ناوەوەی خۆی کرابێت ؛ ئاماژەی شیعریی ئاراستەی خودی شیعرەکە کرابێت.

شیعر خۆی لە هەموو کاتیگۆرییەکی "چەقبەستووی" مانا دەدزێتەوە. باس لە هیچ حەقیقەتێك و باس لە هیچ واقیعێك ناکات، تەنها حەقیقەتی خودی خۆی و واقیعی خودی خۆی بترازێ.

پۆل رۆمپر بە وردی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و دەڵێت "زمانی شیعریی ناهاوجووتبوونە لە گەڵ واقیع". کەواتە ئێمە بەرامبەر بە زمانێکی نوێ و درکردنێکی نوێداین کە نە واقیعمان بۆ دەستنیشان دەکات، نە لە گەڵیدا هەڵ دەکات. کاتێك "هەتاوە رەش"ەکەی نێرڤال-مان بەرچاو دەکەوێت،






ئەم هەتاوە، نەك تەنها هەر هەتاوێکی "ناواقیعییە"، بەڵکو لە کۆتایی و دەسپێکیشدا هەتاوێکی "شیعرییە". کەواتە مانای "موفرەدە"مان لە رێگای قامووس و فەرهەنگەوە دەسگیر نابێت، بەڵکو لە نێو ئەو سیستەمە نوێیەی کە جێگای ئەو موفرەدەیەی گرتووەتەوە. لێرە بە تەواوی هەست بەو دابڕانە لە نێو ئەو دوو سیستەمە زمانەوانییە دەکەین. هەست بەو دوو سیستەمە زمانەوانییە دەکەین کە تیایدا هەست بە دابڕان و دروستکردنەوەی واقیعێکی نوێ دەکرێ، ئەمجارەیان "واقیعێکی شیعرییە".

شیعر تەنها ئەو کاتە لە دایکدەبێت کە وشە مانا فەرهەنگییەکەی لەدەست دەدات و ئیتر بە ئاسانی لە نێو یەکدا جێگۆڕکێیان پێ دەکرێ. بۆ نموونە وشەی "چیا" وەك ئەوەی فەرهەنگی زمان بۆمانی لێکدەداتەوە و وشەی "چیا" لە دەقێکی شیعری ئینگلیزی، یا "چیا" لە شیعری کوردی، بە تایبەت لەم پەنجا ساڵەی دوایی و "چیا" لە شیعرێکی فەرەنسیدا، زۆر جیاوازن. چیای یەکەم خەسڵەتێکی فیزیکی هەیە، کەچی چیاکانی دیکە، هەر چیایە و ئاماژەیەکمان بۆ دەخوێنێتەوە کە شیعرەکە پێشنیاری دەکات. ئەو ئاماژەیەش جێگیر و بڕاوە و کۆتایی پێهاتوو نییە.

لێرەوە مێتافۆر، یا خوازە شوێنی تەواوی خۆی لە دەقی شیعرییدا داگیر دەکات، خوازە هەوڵدانێکە بۆ ئافراندنی مانای دووەم کە جیاوازە لە مانای یەکەم. نەك تەنها هەر جیاوازە، بەڵکو هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە نامێنێ. گواستنەوەی مانای فەرهەنگی بۆ مانا ئاماژەئامێز و بە جۆشوخرۆشەکان، بە واتایەکی دی، گواستنەوەی زمانی عەقڵانییە بەرەو زمانی "ناعەقڵانی"، زمانی بابەتییەوە بۆ زمانی سۆبژەکت، زمانی تاکەکەس، زمانی تایبەت، ئەمە کاری شیعرە. بەڵام نابێت تەماشای مانای دووەم وەکو مانای یەکەم بکرێت، هەمان بەهای کەلتووری و زمانەوانی نییە، یەکەمیان گشتییە، دووەمیان تایبەتە، یەکەمیان جێگیرە، دووەمیان بزێوە، یەکەمیان دیارییکراوە، کە چی دووەمیان لە دونیا ئاماژەدا خۆی دەناسێنێ. بۆیە دەتوانین بڵێین کە شیعر هەوڵێکی بێوچانە لە تێکدانی

نیزامی پەخشان.(بڕوانە لێکۆڵینەوەکەی جان کۆهن کە مێتۆدی لادان بەکاردەهێنێت بۆ جیاکردنەوە زمانی شیعریی لە زمانی پەخشان).

گرفتی مانا لە شیعردا

بەهای شیعرێك لەودانییە چی دەڵێت (هەڵوێستخوازی، ئازایەتی، جوامێریی هتد) بەڵکو چۆن ئەو شتە دەڵێ (فۆرم، شیواز، زمان، دەنگ، بێدەنگی، چۆنیەتی خستنەسەر کاغەز، موفرەدە هتد.)

چونکە کاتێك دەقێکی شیعریی لە ڕێگای ناوەڕۆکێکەوە هەوڵی شیکردنەوەی دەدرێت، ئەمە خۆی لە خویدا، گەڕانێکە لەو شوێنەی کە شیعر وجودی نامێنێت، چونکە ناوەڕۆك خۆی ڕەگەزێکە دژ بە شیعر دەوەستێت. کاتێك دەسپێك ئێمە بە دوای مانادا دەگەڕێین، بە دوای ناوەڕۆکدا دەگەڕێین، واتە هەوڵێکمان خستۆتەگەڕ کە بمانەوێ و نەمانەوێ بە کوشتنی شیعرەکە کۆتایی دێت. جیاکردنەوە مانا، واتە لە ناودانی شیعر. بەدەستخستنی مانا، واتە مردارەوەبوونی دەقێکی شیعری. ئەوەی دەیەوێ دەقێکی مردارەوەبوو ببینێ، دەیەوێ ڕۆڵ و سروشتی ئەو ناوەڕۆکە بناسێ. تەسکردنەوە دەقێکی شیعرییە و بەچوارچێوەرێژکردنێتی.

چونکە لە دەقی شیعریدا، مانا وەکو زەردێنەی هێلکە نییە، دوای ئەوەی هێلکەیەك پاکدەکرێت و بەشە سپییەکەی جودا دەکرێتەوە، دەست بەسەر زەردێنیەکی شێوە خڕ دەگرین کە زەردێنەی هێلکەی پێدەوترێت، بەڵکو شێوە و ناوەڕۆك وەکو هێلکەیەکی شلەقێنراوە، زەردێنە و سپێنییەکەی بە شێوەیەك ئاوێتەی یەك بوونە کە لە کۆتاییدا، نە شیکلەکە دەناسرێتەوە بە تەنها، نە ناوەڕۆك بە بێ ئەو شیکلە وجوودی هەیە. بۆیە نە شیکلێك وجودی هەیە بە بێ مانا، نە مانایەك وجودی هەیە بە بێ شیکل.

زمانی شیعری ئەو زمانەیە کە ڕێگامان لێدەگرێت کە بە تەنها بە دوای "پەیامدا" بگەڕێین، پەیامێکی جیا، چونکە پەیام بە جودا، هیچ بایەخێکی شیعریی نییە، هیچ بەهایەکی شیعریی نییە، چونکە بەهای شیعریی لە ماناکەیدا نییە.




چونکە شیعر نە لە ڕێگای فیکرەوە دەنووسرێت، نە لە ڕێگای هەستەوە، وەکو ئۆسکار وایلد دەڵێ :"هەموو شیعرێکی خراپ بە هەستێکی ڕاستەقینەوە نووسراوە." شیعر تەنها بە وشە دەنووسرێت، ئەو وشانەی کە بە شێوەیەك چوونەتە نێو یەکەوە، بە جۆرێك تێکهەڵکێشی یەك کراون کە تەنها

هونەری شیعر ئەم کارەی پێ دەکرێ.
زمان لە شیعردا لە پێناو ئامانجێك ناخرێتە کار بۆ ئەوەی بمانگەیەنێتە پنتێکی دیاریکراو ( بڕوانە پێنج خاڵەکەی دەسپێك لە بارەی ماناوە) بەڵکو زمان لە هەمان کاتدا، خاڵی دەرچوون و خاڵی گەیشتنەوەیە.
لێرەوە شیعر شێوەیەکی بازنەیی وەردگرێت ( بڕوانە شیعر تەنها بنەمایە، ئەحمەدی مەلا، ئاراس، هەولێر.)
هەر وەکو پۆل ڕۆمپر دەڵێت " وشە لە شیعردا هەوڵی ئەوە دەدا کە لە دایکبوونەوەی خۆیدا خۆی بئافرێنێتەوە." چ لێپرسراوێتییەکی شیعریی و شیکلییە!
ژان دولۆر، بابەتێکی فەلسەفی لە ژێر ناونیشانی "مانای شیعرییەت" دەنووسێ و دەڵێ : "زمانی شیعری وەکو قسەی گیر و عاسی خۆی دەنوێنێ." لە ئەنتیکیتێ یۆنانەوە پێیدا دێتە خوارەوە و قسەی فەیلەسوفانی وەکو سیسێرۆن دەهێنێتەوە و دەنووسێ: "لە لای شاعیران تەرازووی دەنگ بەسەر شتەکانی دیدا زاڵە."دەنگ ئەو دونیایەیە کە لە بێدەنگییەوە ئاماژەکانمان بۆ دەقەپێنێ، نەك بۆ ئەوەی بمانگەیەنێتە شوێنێك، بەڵکو لە خۆمانمان نزیك کاتەوە.
لێرەوە، ئیدی زمانی شیعریی نزیکە لە زمانی "بوون". ئەو بوونەی کە تەنها لە ناو زماندا دەژێت، بەڵام چ زمانێ؟
رونێ شار دەیوت "کاتی ئەوە هاتووە ئەو شتانەی کە قابیل بە لێکدانەوە نین، داوامان بکەن."




پەراوێز:
پۆل ڕۆمپر، لیبێرتێ، بەرگی ١٢، ژمارەی ١، ١٩٧٠، لاپەڕە ٨٨/٧٧
"مانای شیعریی"، ژان دەلۆر، ٢٠٠٢.
ئەحمەدی مەلا: مامۆستای زمان و ئەدەبییاتی فەرەنسی لە زانکۆی کاستییا لا مانچا، ئیسپانیا.

شانۆنامە بۆ منداڵان

# تیتیلە و بیبیلە



6 شانۆنامە

دارشتنەوەی دەق

مۆفەق عارف لەهۆنی

شانۆنامە بۆ منداڵان

تیتیلە و بیبیلە

مۆفەق عارف لەهۆنی





دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

2013



# ژنان بەرامبەر بە دیمەنی ڕووبارەکە






هاینریش بۆڵ

ژنان بەرامبەر بە دیمەنی ڕووبارەکە

عەتا نەهایی



هاینریش بۆڵ وەک نووسەرێکی ڕیالیست، وەک ڕۆشنبیرێکی تووڕە و ڕادیکاڵ، وەک شایەتێکی ڕاستگۆی سەردەمەکەی، وەک خەباتکارێکی ئازا و بوێری سەنگەرەکانی پێشەوەی "یادەوەری دژ بە شاڵاوی فەرامۆشی"، هەموو تەمەنی نووسین و بەهرەی داهێنەرانەی خۆی، بۆ گێڕانەوە و ئاشکراکردنی ڕەهەندە دیار و نادیارەکانی واقیعی مرۆڤ و کۆمەڵگەی ئەڵمانیا لەم سەردەمە پڕ لە کارەسات و نەهامەتییەدا تەرخان دەکات. ئەو بە یارمەتیی ئەزموونەکانی ژیانی خۆی لە بەرەکانی شەڕ و دەستەویەخەبوونی لەگەڵ نەهامەتییەکانی خەڵک و کۆمەڵگەی ئەڵمانیای ساڵانی پێش و پاش شەڕی دووهەمی جیهانی، دەیان بەرهەمی گەورە و گرینگی ئەدەبی، لە بوارەکانی چیرۆک، ڕۆمان، شانۆنامەی ڕادیۆیی و وتار و لێکۆڵینەوەدا دەنووسێت و بۆ ماوەی زیاتر لە نیوسەدە زۆرترین کاریگەری لە سەر کەشوهەوای فیکری، فەرهەنگی و بە تایبەت سیاسیی ئەڵمانیای پاش کۆتایی شەڕ دادەنێت.


**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**2013**




وریا مەزهەر

# بە ئـــارامی تـــووانەوەی چـــلوورەکان



وریا مەزهەر

بە ئـــارامی تـــووانەوەی چـــلوورەکان



## وریا مەزهەر

ساڵی 1975 لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایک بووە.
وریا سەرەتا بە نووسینی شیعر بە زمانی فارسی هاتە ناو دونیای ئەدەبەوە و هەر زوو توانیی وەک یەکێک لە دەنگە جیاواز و جیدییەکان خۆی بناسێنێ، بەتایبەت دوای بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە شیعری (مادە1) و دواتریش کۆمەڵەشیعری (کتاب مشاهیر) زیاتر سەرنجی ڕەخنەگرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. دوای بڵاوبوونەوەی (بیرۆکە کانزاییەکان و هاوار مەکە؛ لەم ئاوێنەیەدا کەس نییە و تەلەفزیۆنی خراپ) ئەم ئەزموونە زیاتر چووە پێشەوە و ناسرا.
وریا مەزهەر لە بواری چیرۆکیشدا بە هەمان شێوە توانیی ببێتە دەنگێکی جیاواز و وەک ئەزموونێکی تایبەت خۆی بناسێنێ.
(بە ئارامی تووانەوەی چلوورەکان) ئەزموونێکە دەبێ بە وردی بخوێندرێتەوە و قسەی لەبارەوە بکرێ... کۆمەڵەچیرۆکێکە باس لە کێشەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمە و گرفتە دەروونییەکانی ئینسان ئەکا لە ئێستادا.
جێی داخە زۆربەی کارەکانی ئەم نووسەرە بە تیراژی کەم و بە چاپی ناشیرین بڵاو بوونەتەوە و باش نەبینراون.
ئەفسووس ئەم دەنگە جیدییەی ئەدەب ساڵی 2011 لە وڵاتی فینلەندا خۆی کوشت و هەموو پرۆژە و کارە جوانەکانی تری لەگەڵ خۆیدا بردە ژێر خاکەوە.. دوای خۆی جگە لە کۆمەڵێک هەوڵی جوانی ئەدەبی و کۆمەڵێ تابلۆی شێوەکاری، کچێکیشی لە دوا بەجێ ماوە بە ناوی (کلارا).


دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

2013




# خەڵاتە ئەدبییە گرنگەکانی فەرەنسا

**بەیان سەلمان**

لە وڵاتی فەرەنسا هەموو ساڵێك لە مانگی ئەیلول (سیپتەمبەر) ئەو کتێبە نوێیانە نمایشدەکرێن کە چاپکراون. ساڵانە نزیکەی **600** ڕۆمان دێنە بازار و بەسەر شارەکانی فە ر ە نسا د ا دابەشدەکرێن. لە








زۆرینەی کتێبفرۆشەکانیش نووسەران ئیمزای خۆیان بەسەر ئەو کتێبانەوە جێدەهێڵن کە خوێنەران دەیکڕن. پارەکە 646 ڕۆمان هاتە بازار، ئەمساڵیش 555 ڕۆمانی نوێ گەیشتنە کتێبخانەکان.
هەموو ساڵێکیش کۆمەڵێ ڕۆماننووس دەخرێنە کێبڕکێی خەڵاتە بەناوبانگەکانی فەرەنسا، وەك خەڵاتی گۆنکور کە گەورەترین خەڵاتی ئەدەبییە بۆ ڕۆمان کە لە ساڵی 1896 بە وسێتنامەی ئیدمۆند دو گۆنکور پاش مردنی داهێنەرنرا و بە شێوەیەکی فەرەمی لە ساڵی 1902 دامزرا و یەکەم خەڵات لە 21ی کانونی یەکەمی "دیسەمبەر" ساڵی 1903 بەخشرا بە جۆن ئەنتوان نۆ لەسەر ڕۆمانی هێزی دوژمن Force ennemie. دوای ئەم خەڵاتی ڕونۆدۆ دێتە کە لە ساڵی 1926 لەلایەن کۆمەڵێ ڕۆژنامەنووس و ڕەخنەگری ئەدبییەوە داهێنرا. ئەوجا خەڵاتی فێمینە دێت کە سێهەمین گەورەترین خەڵاتی فەرەنسییە لە سالی 1904 لەلایەن بیست ژنەوە داهێنرا، پاشان لە ساڵی بیستەکاندا بوونە دوانزە ژن، ئەمەش بە زۆری بۆ بەرپەچدانەوەی خەڵاتی گۆنکور بوو کە دادوەرەکانی تەنها لە پیاو پێکهێنرابوون. دادوەرانی ئەم خەڵاتە تەنها ژنن، بەڵام خەڵاتەکە بە پیاو و ژن دەدرێ و ڕەخنەی زۆر لە خەڵاتی گۆنکور وای کرد کە خەلاتی فیمینە و میدیسیس لە گەرنگیدا ئەو ڕەتدەنەوە.
لە پاش ئەم خەڵاتانە کۆمەڵێکی تر هەن تا دەگاتە خەڵاتی مێدیسیس کە لە زنجیرەدا دەگاتە هەشتەم بەڵام خەڵاتێکی زۆر گرنگە لەبەر جۆرەکەی. لەو نێوەندەدا خەڵاتی گۆنکور بۆ خوێنکارانی ئامدەییش هەیە کە لەساڵی 1988 داهێنراوە؛ خەڵاتی خوێنەری گۆڤاری ئێل کە لەساڵی 1970 داهێنراوە، خەڵاتی خانەی ڕۆژنامەوانیی کە لە سالی 1970 داهێنرا؛ خەڵاتێکی تایبەتیش هەیە بە ناوی ئینتەراێیە کە لە ساڵی 1930 داهێنراوە، دەدرێ بە ڕۆژنامەوانێك کە ڕۆمانێکی نووسیوە؛ خەڵاتی لیڤر ئینتەر لە ساڵی 1975 دەهێنرا، دادوەرەکانی ئەم خەڵاتە لە دوانزە پیاو و دوانزە ژن پێکهاتووە

و دەنگ بە نووسەرێك دەدەن؛ خەڵاتی لێبرێری"کتێبخانە" لە ساڵی **1955** داهێنراوە و دەدرێ بە ڕۆمانێك کە بە زمانی فەرەنسی نووسرابێ؛ خەڵاتی فناك، گەورەترین موغازەی کەلو پەل و کتێبیشە کە بە هاوکاریی **400** بەشدار لە جەماوەردا و **400** کتێبخانە پاش خوێنەوەی **250** ڕۆمان سی بەرهەمی کۆتایی لێ هەڵدەبژێرن و خەڵاتەکە بە دەنگی هەموو ئەو بەشداربوانە بەو نووسەرە دەبەخشرێ. کۆمەڵێ خەڵاتی تریش هەر هەن کە هیچیان لەوانی پێشوو کەمتر بەها نین، وەك خەڵاتی ئاکادیمی فەرەنسی، خەڵاتی ئەلبێر کامو، خەڵاتی ئەپۆلینێر، خەڵاتی ڕادیۆ فرانس کلتوور "ئەمە گەورەترین ڕادیۆی ڕۆشەنبیرییە"...

بە گشتی، خەڵاتەکان بە سێ قۆناغ تێدەپەرن، لە دوو قۆناغی یەکەمدا دەپاڵێورێن و لە سێهەمدا دوا کەس هەڵدەبژێرن. بێگومان خەڵات بەدەر لە ناو و پلەی ئەدەبی و گرنگی ڕۆمان بە لایەنێکی ئابوریشەوە پەیوەستە.

بردنەوەی کتێبێك دەکاتە پڕکردنەوەی سندوقی خانەی چاپ و ئەو کتێبخانانەی کتێبەکەی تێدا دەفرۆشن. خەڵاتی ئەدەبی بەهایەکی مەعنەویشی هەیە کاتێ نووسەرەکەی تا ماوەیەکی زۆر لە باری ئیشی نان پەیداکردن دووردەکەوێتەوە و بە پارەی ئەو خەڵاتە دەژی، یاخود خانەی چاپەکە موچەیەکی مانگانەی بۆ دەبڕنەوە تاکو بەرهەمی تری هەبێ، یاخود پارەی بۆ سەرف دەکەن تاکو بچێتە وڵاتێکی تر و لەوێ کتێبەکەی بنووسێ، دیارە ئەمەیان لەسەر ویستی نووسەرەکە وەستاوە کە مەیلی دەرچوونی هەبێ بۆ شوێنێك پەیوەندی بە نووسینەکەیەوە هەبێ. ئەمە بۆ بڕێکی باش لە نووسەرە ناسراوەکانی فەرەنسا ئەنجامدراوە، وەك بۆ نموونە کامی لۆرانس کە خەڵاتی فیمینەی وەرگرت تا ماوەیەکی زۆر وازی لە ئیش هێنا و بە پارەیە دەژیا و لەهەمانکاتدا مووچەی بۆ بڕابۆوە.
دواجار خەڵات لە نۆبلەوە تاکو بچووکترین خەڵات هەڵبژاردنێکە نەك نرخاندنی باشترین کتێب. لە فەرەنسا گەورەترین خەڵاتی ئەدەبی گۆنکورە، بەڵام مەرج نییە ئەمە باشترین هەڵسەنگانن بێت، چونکو ئەوەی لە هەڵسەنگاندنی خەڵاتەکانی تردا تێبینیدەکرێ وەك فیمینە و مێدیسیس کە نووسەری زۆر گرنگ وەریانگرتوە، واتایەك بە بەخشینی خەڵات دەدات. بۆ نموونە لە ساڵی **1932** خەڵاتی گۆنکور بەخشرا بە نووسەر گی مازولین **Guy Mazeline** بۆ ڕۆمانی "گورەکان" کە بەرامبەر بەو سێلین بۆ ڕۆمانی "گەشت



بۆ قوڵایی نیوەشەو" بە دوو دەنگ خەڵاتەکەی بەرنەکەوت، لەکاتێکدا ئێستا سێلین بە گەورەترین نووسەریان دادەنرێ و مازولین لەبیرچۆتەوە. هەر ئەم لایەشە کە یەکێك لە دادوەرە بەناوبانگەکانی گۆنکوری هاندا بڵێ کە ئەمە شەرمەزارییە بۆ لیژنەکە. هەر وەك زۆر دواتریش گۆڤاری خوێندن Lire لە ساڵی 1999 لەوبارەوە نووسیبوی: "خەڵاتی گۆنکور زۆر بەکەمی دراوە بەو کتێبانەی باشترین کتێبی ئەو ساڵە بوونە". یەکێك لە کێشە گەورەکانی ئەم خەڵاتەش بۆ نەگۆڕینی لیژنەی دادوەرەکان دەگەڕێتەوە. لیژنەی گۆنکور بە پێچەوانەی خەڵاتی پولیتزەری ئەمریکی و خەڵاتی سێرڤانتسی ئیسپانی و خەڵاتی مان بوکەر پرایزی ئینگلیزی لیژەنەیەکی کاتیی نییە هەموو ساڵێ بگۆڕێ، ئەمەش بڕیارەکانیانی خستۆتە جێی گومان، بە تایبەتی تەمەنیشیان کە هەندێ جار جێی تیر و توانجی نووسەران و شارەزایانی خەڵاتە، تەنانەت ژۆل رونار کە نووسەرێکی بەناوبانگی فەرەنسیە پێیان دەڵێ: "پێموابێ لیژنەی گۆنکور نەخۆشە، بە خانە نیشینێك دەچێ لە نێوان هاوڕێیانی کۆندا، چیتر ئەدەب ئەو گرنگییەی لەلایان نەماوە". هەر ئەمەش وایکرد لە ساڵی 2008 دا بڕیار دەرکرا کە دادوەرێك تەمەنی گەیشتە هەشتا ساڵ مافی دەنگدانی نامێنێ. بەم گۆڕانکارییەش لە ساڵی 2008 نووسەری بە ڕچەڵەك مەغەریبی تاهیر بن جەلون بووە ئەندامێکی دەستەی لێژنەی دادوەرانی گۆنکور.

خەڵاتی گۆنکور دەبخشرێ بە ڕۆمان و ژیاننامە و چیرۆك و هەڵبەست و دەقێکی تیوریی و هەرچ داهێنانێکی تر. لەو نووسەرە هەرە بەناوبانگانەی خەلاتی گۆنکوریان وەرگرتوە مارسێل پروست کە لە ساڵی 1919 بۆ ڕۆمانی "لە سێبەری ئەو کچۆڵانەی گوڵیان پێیە À l'ombre des jeunes filles en fleurs" کە لە بنەڕەتدا تەنها بەرگی دووهەمی ڕۆمانە بەناوبانگەکەیەتی نەك هەموو کتێبەکە "لە گەڕاندا بە دوی کاتە ونبووەکان". لەو نووسەرە بەناوبانگانەی تر خەڵاتەکە بە شاتۆبڕییان، ئەندرێە مارلۆ،

ژولیان گراك، سیمۆن دو بۆڤوار، مارگریت دوراس، تاهیر بن جەلون بەخشراوە. لە سەرەتای دروستبوونی خەڵاتەکەشەوە تا ئێستا بە دوو نووسەری ڕەشپێست بەخشراوە پاتریك شاموازۆ **Patrick Chamoiseau** و ماری نیدیای **Marie Ndiaye** کە لە ئێستادا بە یەکێك لە گەورەترین نووسەرە ژنەکانی فەرەنسا دادەنرێ.

مەرج نییە وەرگرتنی خەڵات گەشە بە ڕەوتی نووسەرێك بدات، هەندێ نووسەر زۆر بە تاڵی باسی ئەو ئەزموونەی خۆیان دەکەن، وای دەبینین کە "دیارییەکی ژەهراوییە" وەك ژان لوی بۆری کە ساڵی**1945** خەڵاتی گۆنکوری وەرگرت لەسەر ڕۆمانی گوندەکەم لە سەردەمی ئەڵمانییەکاندا**Mon village à l'heure allemande** ، دواتریش تووشی ڕەشبینی دەبێ و دەگاتە خۆکوشتنی. ژان لوی بوری لەو بارەیەوە وتویەتی:

"... کە خەڵاتی گۆنکور وەردەگری جەماوەر بە شێویەکی ئۆتۆماتیکی لێت نزیکدەبنەوە، دواییش هەر بە ئۆتۆماتیکی لێتدووردەکەونەوە. لە دەرئەنجامدا جەماوەری گەورە ئەو کتێبە خەڵاتکراوەت دەخوێننەوە و ئەوانەی ترت ناخوێننەوە، خەڵکانی کتێب ناسیش کتێبە خەلاتکراوەکەت ناخوێننەوە چونکو خەڵاتی وەرگرتووە و ئەوانەی داهاتوشت ناخوێننەوە لەبەر ئەوەی یەکەمەکەت خەڵاتکراوە".



# سلاڤۆی ژیژاك
# ڕۆمانی دادگایکردنی کافکا ..

**و. لەئەڵمانیەوە : ئیسماعیل حەمەئەمین**




تێکست: کریستۆفەر کول وەنت

نیگارکێشی: پیرۆ

سەرچاوە:

Christopher Kul_Want & Piro , Slavoj ´Zi´zak¸ Ein Sachcomic, Tibia Press 2012

کریستۆڤ کول وەنت وپیرۆ : ژیژاك ، کۆمیکی بابەتی. دەزگای تیبیا پرێس ٢٠١٢




رۆمانی دادگایکردنی فرانز کافکا لە ساڵی **1925** دا نووسراوە، لەم ڕۆمانەدا فڕانز کافکا بەجوانترین شێواز، باس لەوە دەکات، چۆن لە پرۆسەی دادگایکردنی پڕۆتاگۆنیست و پاڵەوانی ڕۆمانەکەی جۆزێف کا، نایاسایی دەبێتە یاسا!، چۆن نایاسایی یاسا ئەبێتە ڕێسای دادگایکردنی پاڵەوانی ڕۆمانەکە..



جۆزێف کا- ی پاڵەوانی ڕۆمانەکە بەهەڵەدا دەچێت کاتێك وامەزندە دەکات، لەنێوان دادوەر و ئامادەبواندا، دژ بەیەکەکان ڕووبەڕوو دەبنەوە. ئەم پاڵەوانە خەیاڵی بۆ ئەوە دەڕوات، کە دادوەر تووڕە دەبێت و ئامادەبووانی لای ڕاست پێدەکەنن و ئەوانەی لای چەپیش مڕۆمۆچ و تورە و بێدەنگ دەمێننەوە!. هەموو ئەم بیرکردنەوانە دەبن بەهەڵم، کاتێك پاڵەوانەکەمان هەوڵدەدات فێڵزانانە و بەتاکتیکەوە وەڵامی پرسیارێکی ئاسایی دادوەر بداتەوە! لەو کاتەدا هەموو ئامادەبوان و تەنانەت دەستەی دادوەریش قاقا بە وەڵامەکەی جۆزیف کا پێدەکەنن..

دادوەری گشتی لە جۆزێف کاـ ی پرسی کەواتە تۆ بۆیاخچی خانوویت؟ ئەمیش گووتی:
نەخێر قوربان من وەکیلی  بانقێکی گەورەم!

ئەم وەڵامە، لای ڕاستی ئامادەبووانی هێنایە
پێکەنین، بەجۆریكێ، لەپێکەنیندا بەهەردوو
دەستیان دەیانکێشا بەئەژنۆیاندا و خۆیان وەها
کۆم کردبۆوە، وەك ئەوەی لەژێر تاوی کۆکەیەکی
توندا بن، ئاوەها لەشیان دەلەرزی. جۆزێف کا
خۆیشی لەگەڵیاندا پێکەنی ..

سلاڤۆ ژیژاك دەڵێت:
کاتێك جۆزێف کا
هەوڵیدا باس لە
گانکردنەکەی خۆی
بکات، هۆڵی دادگا
پڕبوو لەفەوزا،  چونکە
لەگەڵ هەر ڕستیەکیدا
ئامادەبووان لەقاقای
پێکەنینیاندەدا. ئەم
پێکەنینە نەیدەهێشت
جۆزیف کا چیرۆکی
گانکردنەکەی تەواو
بکات...

ئەدەب سەردەم

پەیوەندی نێوان یاسا و قێزەوەنی، پەیوەندی نێوان یاسا و قێزەونیەکی پڕ شۆك، لەدوو دیمەنی پڕ بەراورد بەیەکدا خۆیان نمایشدەکەن: یەکەمیان زۆر بەهەستیاری و ڕۆحییەوە حیکمەتێکمان بۆ باسدەکات: لەدیمەنی یەکەمدا باس لەوە دەکات، کەپیاوێکی لادێی هەوڵدەدات لەدەرگایەکەوە بچێتە نێو هەناوی یاساوە. لەدیمەنی دووهەمدا جۆزێف کا لەبەردەم دەرگای ژووری لێپێچینەوە و دانپێدانانەدا خۆی دەبینێتەوە. لەدیمەنی یەکەمدا پاسەوانی بەردەرگاکە بە جۆزێف کا دەڵێت: ئەم دەرگایە بۆ تۆ دروستکراوە...



لەدیمەنی یەکەمدا و لەبەردەم دەرگای یەکەمدا کارمەندێکی دادگا ڕاوەستاوە. لە دووهەم دیمەن و لەبەردەم دووهەم دەرگادا ئافرەتێکی سێکسی ڕاوەستاوە، کە جلی منداڵان دەشوات. لەبەردەم دەرگای یەکەمدا کارمەندەکەی دادگا نایەڵێت پیاوە گوندییەکە بچێتە بینای دادگاوە، بەڵام لەبەردەم دەرگای دووهەمدا ژنە جل شۆرە سێکسیەکە بەزۆر پیاوەکە دەباتە ژووری لێ پێچینەوە ودانپێدانان.
دیمەنی یەکەم دەیەوێت بڵێت: لەنێوان ژیانی ڕۆژانە و شوێنی پیرۆزدا سنورێك هەیە کەناکرێت ببەزێنرێت، بەڵام دیمەنی دووهەم تەواو پێچەوانەی ئاماژەکانی دیمەنی یەکەمە، بەوەی ڕاستە سنورەکان بوونیان هەیە، بەڵام دەکرێت بازهەڵدەین بەسەریدا...



Persian Literature

لەم ژمارەیەی گۆڤاری ئەدەبی سەردەمەوە هەوڵ ئەدەین پردێك دروستبکەین بۆ ناساندنی ئەدەبی فارسی، ئەویش لەڕێگای وەرگێڕانی دەقی ئەو نووسەرانەی کە پێشتر وەك پێویست نەناسێنراون بە خوێنەرانی کورد، هەروەها سازاندنی گفتوگۆی دەوڵەمەند لەگەڵیاندا بۆ ئەوەی زیاتر بتوانین دنیا جیاوازەکانیان ببینین، ئەمەش لە پێناو نزیکبوونەوە و ناساندنی زیاتری ئەدەبی فارسییە کە هەم وەك جوگرافیا و هەم وەك زمان و خەیاڵ نزیکە لە دنیای ئەدەبی کوردی و زمانی کوردییەوە.

# ئەدەبی فارسی

ئەدەبی سەردەم



# حافز مووسەوی

## شیعر لەم سەدەیەدا ڕۆڵێکی گەورە و کارا دەبینێت

**وتووێژ لەگەڵ حافز مووسەوی**
**شاعیر و رەخنەگەری بەناوبانگی ئێران**
**ئامادە کردن و وەرگێڕان لە فارسییەوە: بابەک سەحرانەوەرد**

دەسپێك:

یەکەم جار ناوی حافز مووسەوی ـ م وەك شاعێرێکی جیدی، دوای وەرگرتنی"پێنووسی زێڕینی گەردوون" لە ساڵی **1994**دا بیست کە خەڵاتێکی بەناوبانگی ئەو سەردەمە بوو. کۆمەڵە شیعری "دەستێك بەشووشە تەمگرتووەکانی دونیا" بەجۆرێك لەو سەردەمەدا هەراوهەنگامەیەکی بەرپاکرد وایکرد خوێنەرانێکی زۆر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. بەڵام ئایا چ شتگەلێك بوونە هۆی سەرکەوتوویی ئەم کتێبە کە شاعیرەکەی دوای بیست ساڵ ئەزموونی شەخسی و ئەدەبی لە تەمەنی **40** ساڵیدا لەچاپی دابوو. حافز

توانیبووی لەم کتێبەدا زمانێکی چڕ بخولقێنێ و مانای جۆراوجوری لێ بووروژێنێ. هەرچەند ئەو بەم کارە قانع نەبوو. بۆیە ئەزموونی ئەو قۆناغەی تێپەڕاند و بووە شاعیرێکی خاوەن دەنگ و تایبەتمەند بە خۆی.
بەرهەمە چاپکراوەکانی حافز مووسەوی بریتین لە:

دەستێ بە شووشە تەمگرتووەکانی دونیا، 1994، تاران.
ڕستە نهێنییەکان، 1999، تاران.
شێعرگەلی کۆمار، 2001، تاران.
ژن، تاریکی، وشەکان، 2007، تاران.
وردەواڵەی یادەوەری و شێعرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، 2009، تاران.

حافز لەم چەند ساڵەی دواتردا دوو کتێبی دیکەیشی بڵاوکردوە کە یەکەمیان کۆمەڵە وتارێکە لەسەر شێعرەکانی مەهدی ئەخەوان سالس کە بڵاوگەی پەیڤ لەچاپیداوە و کتێبی دووهەم، کۆمەڵێك وتاری ڕەخنەییيە. لەم هاوینەدا بەهۆی ئەم وتووێژەوە چوومە لای. وەك جاران بە رووخۆشییەوە بەرەوپیرم هات و لە ئامێزی گرتم، داوای لێکردم دانیشم. لەپاش مانەوەیەکی کەمخایەن حافز بە دوو چا دێتەلام و بزەکەی هەر بە لێویەتی و لە بارودۆخی کوردستان لێم دەپرسێ، منیش دوای ماوەیەك پرسیارەکانی ئاڕاستە دەکەم و ئەویش بەلەبزێکی هێواش و کاوەخوییەوە دێتە وەڵام.




**بابەک سەحرانەوەرد:** دۆستی ئازیز، وێڕای سوپاس لە ئێوە بۆ ئەم گفتوگۆیە، بۆ دەسپێك باشتر ئەوەیە کەمێك لە خۆتان بدوێن، لە واقیعدا پێم خۆشە ناسنامەیەکی خۆتانم هەر لەسەرەتاوە تائێستا بۆ باسبکەیت.

**حافز مووسەوی:** من لە 15ی ڕەشەمەی ساڵی 1333ی هەتاوی بەرامبەر بە 1954ی زاینی لە شاری روودبار سەر بە باکووری ئێران لە بنەماڵەیەکی مامناوەند لەدایکبووم، هەتا قۆناغی دبلۆم لەو شارە ماومەتەوە. دواتر بۆ درێژەدان بەخوێندن لە بەشی زمان و ئەدەبی فارسی لە زانستگا میللیی ئەو سەردەمە شەهید بەهشتی ئێستا چوومەتە تاران. لە نێوان ژیانی تاران

و خوێندکاری زانستگا، لە ڕەوتی شۆڕشی فەرهەنگی و کەلتووری گەلانی ئێران لە زانستگا دەرکرام و بڕوانامەی خوێنەوارییەکەم بۆ هەمیشە داخرا. لە ساڵگەلی مێردمنداڵیدا، واتە لە ساڵی 1351 هۆگری خۆم بە پارتی مارکسیزم نیشاندا و شان بە شانی چالاکییە ئەدەبییەکەم، لەبواری سیاسیش فرەچالاك بووم. ڕاپەڕینی ئێران لە ساڵی 57 و فەزای داسەپاندن و دەمکوتی و پڕ لەمەترسی شەستەکان بواری ژیانی من و هاونەوەکانمی تووش ئاڵوگۆڕییەکی نەخوازیار کرد. لە کۆتایی شەستەکان، دوای کوتایی هاتنی شەڕی ئێران و عێراق فەزای ڕامیاری و کەلتووری ئێران کەم تازۆر ئاوەڵاتربوو و چەند گۆڤارێکی سەربەخۆی ئەدەبی سەریانهەڵدا و بڵاوبوونەوە. منیش لەم دەورانە بە کەڵك وەرگرتن لەم دەرفەتە لەگەڵ بڵاڤۆکەکان هاوکاریم دەکرد و لەئەنجام لە ساڵی1373 ی

هەتاوی 1994زاینی یەکەمین کۆمەڵە شێعرم لە تەمەنی 40 ساڵیدا بە ناوی "دەستێك بە شووشە تەم گرتووەکانی دونیا" بڵاوکردەوە. ئەم کۆمەڵە شیعرە، هەڵگری خەڵاتی قەڵەمی زێڕینی گەردوون بوو، سەرجەم پێشوازییەکی فرەباشی لێکرا. دەیەی حەفتا بۆ شیعری فارسی دەیەیەکی موبارەك و زۆر باش بوو، شیعری فارسیی خستە ناو قۆناغێکی تازەوە. لە سەرەتای ئەم دەیەدا من و هاوڕێکانم کە پتر گەنجبووین و زۆرشەیدابووین، ڕێکخراوەیەکمان سازاند کە ڕۆڵێکی کارای لە گۆڕانکاریەکانی دەیەی حەفتا لە ئەستۆ گرتبوو. دوو کتێبی "ڕستە نهێنییەکان" و "شیعرگەلی کۆماری" من دەسکەوتی ئەو قۆناغە بوون. دوای ئەم دووناميلکە شیعرییە دوو کۆمەڵە شیعری دیکەیشم بڵاوکردەوە و کۆمەڵەیەکی تریشم هەبوون کە ئیزنی چاپی پێنەدرا، یەك کۆمەڵەی دیکەشم هەن لەلای دەزگایەکی چاپەمەنییە و چاوەڕێی ئیزنی چاپە. بەرلەم کتێبانە، کتێبی "پانووسەکان"م لەم ساڵەگەلەی دواییدا چاپکردووە و کۆمەڵەیەکە لە چەند زنجیرە وتار و باسە هزرییەکان پێکهاتوون بەتایبەت بیرۆکەی شیعری نیمایە. لەبواری چالاکی ڕۆژنامەوانییەکەشمدا دەبێ لێرەدا ئاماژە بە گۆڤاری"کارنامە" بدەم کە یادەوەریی زۆرخۆشم لەگەڵیدا هەیە، بەڵام بەداخەوە لە قۆناغێکدا کە من بەڕێوبەری نووسینی ئەم گۆڤارە بووم ڕێی بڵاوبوونەوی لێبەسرا و بۆ هەمیشە

داخرا. دوا کارنامەم لەگەڵ قوتابیەکانمدا ئەویش ئەوەیە کە گۆڤارێکی ئەدەبیمان ڕەخساند بەناوی "وازنا" کە گەشەی زۆری سەند بەڵام ئەمەیش ناپایار بوو، چونکە دو سێ ساڵە ئەویشیان داخستووە.

**بابەک سەحرانەوەرد:** ئەگەر دەکرێ پێم خۆشە کەمێك باسی ئەو شاعیرانە بکەیت کە خۆشت ئەوێن. چ کەسێتیگەلێك ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لەسەر ئێوە تەئسیری هەبووە؟

**حافز مووسەوی:** من بە هۆی هەلومەرجی خێزانەکەم لە هەرەتی مێردمنداڵیمەوە تا ڕادەیەك ڕمووەدەی شیعری کلاسیکی فارسی بووم، بەڵام دوای خوێندنەوەی شیعرەکانی شاملوو و فروغ فەرۆخزاد بەتەواوەتی چوومە ژێر پەنجەی دەسەڵاتی ئەم دوو کەسێتییە. دواتر هۆگرایەتیەکی خەستوخۆڵم لەگەڵ شیعری ئاتەشی و ئەخەوان سالس پەیداکرد و منیان بەدووی خۆیاندا ڕاکێشا. هەندێك درەنگتر هۆگری شێعری"نیما"بووم هەتا ئەوەی کە لە کۆتایی شەستەکاندا نیمام هەمدیس بۆ خۆم دۆزییەوە و هەر ئەم دۆزینەوەیە بووە هۆی ئەوەی کە ڕەوت و ڕێچکەی شیعری منی بەرجەستەکردەوە.

**بابەک سەحرانەوەرد:** بەڕای ئێوە کۆمەڵگای ئەدەبی خاوێن و تەندروست چ پێوەرگەلێکی لەبۆ خۆی تەرخان کردووە. دەبێ لە چ دۆخێکدابێت و ئەم کۆمەڵگەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ شاعیران و نووسەرانێکی وەك ئێوە بە چ شێوەیەك بووە؟

**حافز مووسەوی:** ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبێتم یەکێك لە ڕەخنەگەرە ڕۆژئاواییەکان لەمەڕ شوێنگە و پێگەی شاعیران لە سەدەی نۆزدەهەمدا وتوویەتی کە ئەوان پێغەمبەرانی ڕۆژگاری خۆیان بوون، بەڵام بەداخەوە ئەوان لە ڕۆژگارێکدا سەریانهەڵدابوو کە کەسێك نەیدەویست بۆ پیشەی موبارەکی پێغەمبەرئاساکەی دەستخۆشانەی بۆ بنێرێت. من وابۆی دەچم هەلومەرجەکان کەم تازۆر هەروەك چاخە پێشووەکان ماوەتەوە. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە بڵێین شاعیران گیانلەبەرانێکی بێکەڵك و ناپێویستن. بەپێچەوانەوە، بەبڕوای من شیعر لە ڕۆژگاری ئێمەدا زۆرتر لە هەموو کاتێ پێویست و بەنیازە. شیعر لە سەدەی بیستەمدا



ڕۆڵێکی گەورە و کارا دەبینێت. ئەگەر ڕۆڵی رزگاریکەری بەشی شیعر نەبووایە دیارنەبوو چارەنووسی مرۆڤ لە سەدەی بیستەم بە کوێ دەگەیشت. مەبەستم لە شیعر، ئەو مانا فرە ڕەهەند و پانتاییەیە کە بەشگەلێکی هەر زۆر گرنگ لە هونەر و ئەدەبی لەخۆ گرتووە. ئەوەشی کە دەسەڵاتداران شیعر وەك توخمێکی ئازاردەر و پڕدەردیسەر دەبینن، بەڵگەیەکی لە پشتەوەیە. شیعر هەر ئێستایش ئەرکی هەڵخراندن و وروژاندنی لەئەستۆگرتووە. ئێستایش هەر بڵندترین پایەیە لە درەوشانەوەی هەست و عاتیفەی مرۆڤ دا. مەسەلەی شیعر لە ئێراندا بەر لەم شتگەلە لە زۆر لایەنی ترەوە هەر گرینگ و هەستۆکە. کەواتە ئەو شتەی کە بەسەر شاعیران و شیعری ئێمە لەم سی ساڵەدا هاتووە، لەگەڵ ئەم هەستۆکییەدا زۆر پەیوەندیدارە. شاعیرانی هاوچەرخی ئێمە بە درێژایی ئەم سی ساڵە لە قۆناغگەلێك کەمتر و لەقۆناغگەلێك زیاتردا ڕەتکراونەتەوە و زوڵمیان لێکراوە، کەوتوونەتە بەر سانسۆر، سەرکوت و قۆڵبەست کراون، بەڵام لە پلەوپایە و شوێنگەی خۆیاندا لە کەلتووری ئەم وڵاتەدا نەك تەنیا نوشوستیان نەهێناوە، بەڵکو گەورەتر بوون و زۆرتریش پەسەند کراون.

**بابەک سەحرانەوەرد:** ئایا لە ڕووی دۆخی ئەم چەند ساڵەی دواییەوە، بارودۆخی فەزای ئەدەبیی ئێران چۆن لێکدەدەنەوە؟

**حافز مووسەوی:** لە ئێراندا بەر لە ئەدەبی فارسی، ئەدەبی"کوردی، تورکی، تالیشی، گیلەکی، تەبەری"یش بەرهەم دێن. هەتا ئەو جێگایە کە من شارەزام لە حەفتاکانەوە کاری هەرە باش لەم بەشانەدا کراوە. لە ئەدەبی فارسیشدا بەر لەوەی کە لە ناوەوەی وڵات هەندێك کاری گرینگ بەرهەم هاتوون، بەشێکی دیکەیش لە دەرەوەی ئێران بەرهەم دێت کە زنجیرەیەکی نەپچراوە لە ئەدەبی ئەمڕۆی ئێران. لە ناو وڵاتدا ئەدەبی فارسی لە دەیەی حەفتا بەدواوە چووەتە نێو قۆناغێکی تازەوە کە دەسکەوتەکانی ڕەنگە هێشتا زۆر نەکەوتبنە بەرچاو. لە شیعر، چیرۆك، شانۆنامەدا کەسێتیگەلی تازە سەریانهەڵداوە کە هەرچەند لە ژێر سێبەری ناوە گەورەکانی دەیەی چل ماونەتەوە، بەڵام بێگومان لە داهاتوودا بە کارنامە و دۆسییە

ئەدەبییەکانیان ئەدەبی ئەم نەوە نوێیە سەرکەوتووانە دەرئەکەون. ئەتوانم بڵێم کە جێی بەختەوەرییە پشکی ژنان لە ناو ئەم نەوەیەدا زۆرتر لە قۆناغەکانی تر لەبەرچاون. بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەدەبی ئێمە لە دۆخێکی زۆر پرمەترسیدایە. دەزگای سانسۆر بەتایبەت لەم چوار پێنج ساڵەی دواییدا، بەڕاستی زوڵم و زۆرێکی گەورەی کردووە. زۆربەی شاعیر و نووسەرانی سەربەخۆی ئێمە بەشێکی زۆر لە بەرهەمەکانیان لە ئیدارەی سانسۆردا ماونەتەوە و خۆڵ دەخۆن. ڕۆمانی "سەرهەنگ"ی مەحموود دەوڵەت ئابادی کە بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیش بڵاوبووەتەوە و ساڵی پاریش کاندیدی دوو خەڵاتی نێودەوڵەتی بووە هێشتا لە خودی ئێراندا مەجالی چاپی پێنەدراوە. هیچ کام لە کتێبە تازەکانی خۆم لەم چوار پێنج ساڵەدا ئیزنی چاپیان وەرنەگرتووە. ئەو کتێبانەیش کە چاپ دەبن بە زۆری بەشێك لە هێز و وزەی خۆیان لە ژێر تیغی سانسۆردا لەدەسداوە.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە دۆسیەی ئەدەبی ئێوەدا بەر لە شیعر چاومان بە وتارە ڕەخنەییەکانتان کەوتووە. ئەگەرچی ئێمە لە چلەکاندا ڕەخنەگەرێکی گەورەی وەك "دکتۆر ڕەزا بەراهەنی"مان هەبووە و یەکەمین کۆڵەکەکانی ڕەخنەی جیدی و مۆدێرن لە بەرهەمگەلی ئەون، بەتایبەت لە کتێبی "ئاڵتوون لە مسدا" کە بونیاتنەری کارێکی گەورەی ئەوتۆبوو بەجۆرێ دەستیدایە سڕینەوەی پیرۆزییەت لە ئەدەبدا، ئەی ئایە بۆچی ئەمڕۆکە ڕەخنە وەك جاران نەیتوانیوە ئەو کارکردەی جارانی هەبێ. ئاخۆ ئێوە باوەڕتان بە قەیرانی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری هاوچەرخی ئێرانیدا هەیە؟ ئایە لاوازی ڕەخنە چ کاریگەرییەك ئەکاتە سەر گەشەسەندنی شیعر و دەتوانێت چ کاریگەرییەکی هەبێت؟




**حافز مووسەوی:** ئەمە ڕاستە کە ڕەخنەی ئێمە لەگەڵ شیعر و ئەدەبەکەمان پێکەوە هەنگاوی نەناوە و پەرەی نەسەندووە، بەڵام ئەمەیش لەیاد نەکەین دکتۆر بەراهەنی بەشێکی گرینگ لە وتارە ڕەخنەییەکانی خۆی لە دەیەی 60 و 70دا نووسیوە. خوالێخۆشبوو "محەممەد حقوقی"ش هەروەتر. بەڵام لەمەڕ کارتێکەری ڕەخنەی ئەدەبی لەدەیەی چل و پەنجای هەتاوی لەگەڵ ئێوە هاوبیر و کۆکم. هۆی کارتێکەریی دکتۆر بەراهەنی لەم چاخە بەر لە زانست و توانایی

و بزێوی تاکەکەسیی و شەخسیی خۆی، ئەوە بوو کە ئەو رەخنانە بەگشتی لە ژێر دەسەڵاتی گوتارێکی سەرتری جیهانیدا بوون کە لە نێوان رۆشنبیرەکانی ئێران کریاری زۆری هەبوو. لەواقیعدا ئێمەی ئێرانی لەو سەردەمە بێجگە لەوەی کە لە ڕوانگەی تێفکرینی فەلسەفی بە نیسبەتی ئەمڕۆ زۆر هەژار و دەستەنگ بووین، بەڵام هەستمان بە دەستەنگی نەدەکرد. رەخنەی ئەدەبی بە هەر چەشن لە ژێر سێبەر و کارتێکەری ڕێکوپێکانەی فەلسەفی بیچم دەگرێت. زاڵبوون و سەرکەوتوویی فیکر و ئەندێشەی مارکسیستی لە فەزای رۆشنبیری ئێران لەو سەردەمەدا روانگە و نیگایەکی نوێی بە رەخنەی ئەدەبی و تەنانەت بەرهەمگەلی ئەدەبی ئێمە بەخشی، هەر ئەم روانگەیەش بووە هۆی یەکگرتوویی ئەدەبەکەمان و ئەم یەکگرتووییە لەگەڵ ئەو باکگراوەندە کە باسم کرد بەشێوەیەکی بەربڵاو گەشەی سەند. دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، ئەو یەکگرتووییە جێی خۆی بە پەشۆکاویی و بێ سەرەوبەرەییدا. بێ سەرووەرییەك کە لە شیعر و رەخنە ئەدەبییەکانی دکتۆر بەراهەنی ڕەنگێکی ئەوتۆی گرتووە. من نەفسی ئەم پڕش و بڵاوییە بە شتێکی باش دەزانم . یەك لەشکەری یەکگرتوو ئەگەرچی زووتر بە ئاکام بگات بەڵام لەولایشەوە مەترسی دکتاتۆریشی لەگەڵدایە. ئەتوانین بەم شێوەیە قسەکەمان خڕکەینەوە کە هەرچەند توند و خێرایی کارتێکەریی رەخنەی ئێمە بە نیسبەتی ڕابردوو کەم و لاواز بووە بەڵام قووڵتر بووەتەوە. هەڵبەت لەم نێوانەدا نابێت ڕۆڵی نەبوونی گۆڤارە ئەدەبییە سەربەخۆ و بەردەوامەکان لەیاد کەین. ئەگەر ئەم گۆڤارانە وەك ئادینە، گەردوون، دوونیای سوخەن، تەکاپوو کارنامە هێشتایش هەر هەبوونایە، دیارە رەخنەی ئەدەبی ئێمە لە دۆخێکی زۆر باشتر لە ئێستادا ئەبوو. کتێب و ڕۆژنامە کەرەسەگەلێکی لێهاتوو و پەسەند نین بۆ ڕەخنەی ئەدەبی. یەکەمیان زۆر درەنگ دێتە بەرچاوی خوێنەر و دووهەمیشیان زۆر زوو چاپ دەبێ. ئەگەر گۆڤارێك وەك فێردۆسی نەبووایە بەدڵنیاییەوە بەشێکی گەورە لەو وتارە رەخنەیانەی دکتۆر بەراهەنی هەر بوونی نەدەبوو.

**بابەک سەحرانەوەرد:** بەردەوام باسی سادەیی و جیاوازبوون لە شیعردا لە ئارادابووە و خۆی بەرجەستە کردووەتەوە.

بەڕای ئێوە شێعری سانا و جیاواز چۆنە؟ ئەم سانایی و جیاوازییە لە هەر چاخێکدا بە نیسبەت چ پێوەرگەلێك هاتۆتە ئاراوە و چ نرخێکی هەبووە؟

**حافز مووسەوی:** شیعری سانا دەتوانێ جیاواز بێت. مەبەستم ئەوەیە کە سانایی بەتەنیایی جێگری جیاوازی نییە. ئەگەر سانایی کاردانەوەیەك لەبەرانبەری دەسکرد بزانین، لەگەڵ ئەم پرسە کۆکم. باسێك کە ئەم ساڵانە لەمەڕ سانانووسین هاتۆتە ئاراوە، رەگەزەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی شەست. پێش ئەم دەیە زمانی پێوەر لە شیعری فارسی زمانێك بوو لە جنسی زمانی شاملوو، ئەخەوان، رۆیایی و هتد. لە زمانی ئەم شاعیرانە جۆرە سەنعەت و زمانپاراوییەکدا بوونی هەبوو کە ئەگەرچی لەگەڵ جیهانی شیعرەکانیاندا بەتەواوەتی هاوشان بوو، بەڵام نەیدەتوانی وەڵامدانەوەی ئەزموونگەلی نەوەکانی دوای ئەوان بێت. بەم هۆیە نەوەکانی دوایی واتە نەوەیەك کە لە کۆتایی دەیەی **60** دا قەڵەمی دەسگرت و هاتنە گۆڕەپانی شیعرەوە، دژ بەم زمانە ڕاوەستان و ڕویانکردە زمانێکی چڕ و پڕ و خاوێن تر. هەڵبەت ئەم نەوەیە داهێنەری ئەم زمانە نەبووە. ئەم زمانە لەشیعر و کانگای داهێنانی شاعیرانێکی وەك فروغ، سوهراب، ئەحمەد ڕەزا ئەحمەدی بووەو لەهەموویشی گرینگتر لە شیعر و بیرۆکەگەلی نیما هەڵقوڵاوە و پێشینەیەکی کۆن و تیشکدەر و دیاری هەبووە. زمانی شیعری نیما یووشیج هەرچەند دژوار دێتەبەرچاو، بەڵام دەسکرد و ئاڵۆزاوی نییە. ئامانجی نیما، هەروەك خۆی چەندەها جار ئاماژەی بۆکردووە، بۆتە هۆی ئەوەی زمانی فارسی نزیك بکاتەوە لە پەخشان. نیما دەیوت شاعیر دەبێ شیعرەکەی هەر بەو زمانە بنووسێ کە خەڵك پێی ئەدوێن. دیارە مەبەستی نیما ئەوە نەبووە کە زمانی شیعر دەبێ بە تەواوەتی وەك زمانی جەماوەر بێت. باوەڕی وابوو کە دەبێ زمانی "ئارگۆ" لەگەڵ زمانی "ئێروس" ئاوێتە بکرێ و لە ئاوێتەی ئەم دووانە زمانێك بێتەئاراوە کە لە جنسی زمانی خەڵکە، بەڵام لە پلە و پایەیەکی بەرزتردایە. لە کۆتایی شەستەکان نەك تەنیا شاعیرانی نەوەی نوێ، بەڵکوو شاعیرە ناودارە بەرەو پێشووەکانیش لە زمانی ئەدەبی و بەگشتی حیماسی و پاڵەوانانە و عیرفانییەوە ڕوویانکردە زمانێکی ئاسایی و ساکارتر. ئەم ڕەوتە گەورەترین و بەربڵاوترین بەشە لە شیعری ئەمڕۆی ئێراندا و گەشەی سەندووە و بووە بە زمانی زۆربەی شاعیرانی ئێمە. بەڵام لەلایەکیترەوە هەر



ئەم ڕەوتە دەسکەوتگەلێکی نێگەتیڤیشی لەخۆگرتووە، گرنگترینیان بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی زمانێکی سست و لاواز و شێواوە لەناو گروپی شاعیرە گەنج و کەمتر گەنجەکاندا که لەولای بانەوە کەوتوونەتە خوار و دەبیندرێت. تا ئێرە من تەنیا نیوەی پرسیارەکەی ئێوەم وەڵام داوەتەوە. نیوەکەی دیکە پەیوەندیی بە ڕەوتێك و گروپێکی دیکەوە هەیە کە هەرچەند زمانی شیعری شاملوو و ئەخەوان سالس پەسەند ناکەن و ئامانجیشیان لەواقیعدا ڕوهێنان بە قسەزانی و سەنعەتە ئەدەبییە کۆنەکان نییە، بەڵام لەسەر ئەو بیرە سوورن کە شیعر دەبێ تەنیا و تەنیا "زمان"بێت. واتە "شیعری زمان" یان هەر ئەو زمانەی کە دکتۆر بەراهەنی باسی لێکردووە. ئەم ڕەوتە لەیەك لاوە لە پۆستمۆدێرنیزم کە بەڕای من زۆریش تیشکدەر و ڕوون نییە تەئسیری وەرگرتووە و لەلایەکیتریشەوە ڕەگوریشەکانی لە زمانی عیرفانی ئیسلامی و میراتی "هۆشەنگ ئێرانی"دا داکوتاوە. من نە تەنیا لەگەڵ نەفسی جیاوازدا کێشەم نییە، بەڵکو لەوبڕوایەدام کە هەر بەرهەمێکی هونەری ڕەسەن لە زاتی خۆیدا دیاردەیەکی نوێ و تازەیە کە دووپات نابێتەوە و لە ئاکامیشدا جیاوازە. بەڵام بەم حاڵەیش نەفسی جیاوازیی و تەنانەت نوێ بوونەوە ناتوانێت لەسەر چارەنووسی بەرهەمی هونەری مسۆگەر بێت و بەتەواوی خۆی بسەلمێنێت.

**بابەک سەحرانەوەرد:** تاقمێك لە ڕوناکبیران لەو باوەڕەدان کە نووسەر دەبێ لە زاتی خۆیەوە، بەردەوام بەرهەڵست و رەخنەگر بێ و هەمیشە دەنگ هەڵبڕێ؛ چونکە نووسەر لەواقیعدا بشێوەخواز "ئانار شیستە". لەلایەکی دیکەوە دەبینین برێك لە رۆشنبیران لە هەر کۆمەڵگە و لە هەرچاخێکدا بن بۆ حوکومەتە دیکتاتۆرەکان دەستی دۆستایەتییان درێژ کردووە و تەنانەت پێوەرگەلی ئەو حکومەتە بەجۆرێ لە بەرهەمگەلی خۆیاندا بەرجەستە دەکەن. ئاخۆ ئێوەیش لەبڕوایەدان کە بەرهەڵستی دەبێ لە زات و کانگای ئەدەبەوە هەڵقوڵێت؟

**حافز مووسەوی:** بەڵێ. من لەگەڵ ئەم بیرە کۆکم کە هونەر لەزاتی خۆیدا جۆرێك بەرەنگاری و بەرهەڵستییە.

بەرەنگاری بە تەکووزی پڕ لە ناتەبایی جیهان و بەرەنگاری بە بێ عەدالەتی، بەرەنگاری بە هێز و دەسەڵات. هونەر تەنانەت لە چەشنە ئەڤیندارانەکەشیدا ئەم خسوسییەتەی هەیە. هونەر جۆرە پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەگەڵ جیهاندا ڕەخساندووە. جۆرە ناسینێکە لەسەر کۆڵەکەی ئەزموونی شەخسی و لەسەر ئەم کۆڵەکەیە کە لەگەڵ ئایدۆلۆژیادا سەری سازیاری نییە و دژبەرایەتییان تێدا ڕەخساوە. "ئالتۆوسێر" لەوبڕوایەدایە کە تەنیا لەرێگەی هونەرەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت لە ژێر پەنجەی دەسەڵاتی ئایدۆلوژی خۆی قوتارکات. مەبەستی منیش لە ئایدۆلۆژی، هەرچەمکی "زانیاری و ئاگایی درۆینەیە" کە کەسێك وەك "ئادۆرنۆ" لەسەری زۆر دواوە. واتە باشتر ئەوەیە کە ئێمە حیسابی هونەر لە هونەرمەند جیاکەینەوە، ئەگینا چلۆن باوڕبێنین کە خاوەن هونەر لەگەڵ خاوەن هێزێکی دیکتاتۆری هاوکار و هاوقۆڵ نەبێت؟

**بابەک سەحرانەوەرد:** بەڕای ئێوە گۆڕانکاری و نوێخوازی لە زاتی ئەدەب لە هەر چاخ و دەورەیەکدا شتێکی پێویستە یا ئەوەی کە لە بنەڕەتدا گۆڕان و نوێخوازی هەڵقولاوی گۆڕانکارییە سیاسی و کلتوورییەکانی کۆمەڵگەیە؟

**حافز مووسەوی:** هەروا کە لە پەراوێزی پرسیارە پێشووەکان ئاماژەم پێدا، مەیلی نوێخوازی و نوێ هێنان لە زاتی هونەر و ئەدەبدا هەمیشە بووە. هونەرمەند بەردەوامە لە جەخت کردن بۆ ئەوەی شتی نوێ بخولقێنێ کە بەر لە چرکەساتێك هەربوونی نەبووە. بەڵام ئەو کاتەی لەمەڕ گۆڕان و گۆڕانکاری کە دیاریکەری قۆناغە ئەدەبی و هونەرییەکانە ئەدوێین، ئەم گۆڕانە وەك کارێکی شەخسی خۆی دەرناخات، بەڵکوو دەسکەوتی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانە. بۆ نموونە ئێمە ناتوانین لەمەڕ قۆناغی رۆمانتیزم بدوێین، لەحاڵێکدا کە هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکەی ئەرووپای سەدەی نۆزدەهەم نەخەینە بەر دید. یان بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت ئەدەبی مۆدێڕن لێکبەینەوە دەبێ پێش ئەویش لە بوارە کۆمەڵایەتییەکان کە دەگاتە رەتکردنەوەی رۆمانتیزمیش ئاورێك بدەینەوە. لە وڵاتی ئێمە سەرهەڵدانی ئەدەبی مۆدێڕن دەسکەوتی زەوق و سەلیقەی تاکەکەسیی"نیما یووشیج" و "سادق هیدایەت" نەبوو . ئەم دووە بە تەواوی بزێوی و گەورەییان تەنیا لەو هەلومەرجە دیاریکراوە مێژووییە،



نەك سەد ساڵ لەمەوبەر دەیانتوانی بنیادنەری ئەدەبی نوێ بن.

**بابەک سەحرانەوەرد:** موراد فەرهادپوور لێکۆڵەر و نووسەر لە وتوویژێکدا وتبوی کە شیعری ئێمە"ئیران" لە چوارچێوەی رۆمانتیزمی عیرفانی گۆڕاوە، لە حاڵێکدا ئێمە شاعیرانێکی تریشمان وەك شاملوو، فروغ و ئاتەشی و ڕەحمانی هەبووە کە روانگەیەکی زۆر جیاوازیان لەگەڵ سوهراب لەم ڕووەوە هەبووە. ئایا لە روانگەی ئێوەوە شیعری هاوچەرخ بەو پێشڕوتگەلە گرینگە گەیشتووە یا نا؟

**حافز مووسەوی:** قسەی فەرهادپوور لەمەڕ بەشگەلێك لە شیعری هاوچەرخی فارسی ڕاستە. هەرواکە دەزانن لە پاڵ ڕەوتی سەرەکی شیعری نوێی فارسی کە چاوگەکەی لە نیمایەوە دەسپێدەکا، بزاڤ و بزووتنەوەی دیکەیشی بۆ رەخساوە کە هێشتایش بەدەنگ و خوێنەری زۆری هەیە. یەکەمین کەسێك کە لە روانگەیەکی بەڕواڵەت مۆدێڕن لەبەرانبەر نیمادا وەستا و خۆی بەرز کردەوە، هۆشەنگ ئێرانی بوو. یەکێك لە بەرەنگارییەکانی

هۆشەنگ بە نیسبەت نیما ئەوە بوو کە بۆچی نیما و شیعری نیمایی لە داب و نەریتی عیرفانی شیعری کلاسیکی فارسی خۆی دوور کردۆتەوە و ئاوڕی لێنەداوەتەوە. ئەو دەیویست ئەم داب و نەریتە هەمدیسان زیندوو بکاتەوە و بیهێنێتە ئاراوە. ئەو لە یەکێك لە وتارەکانی گەیشتن بە عیرفانی "سەنایی" وەك ترۆپکی شاعیرانەبوون و بەرزی و هەڤیازی هەر شتێکی باش لە شاعیردا دەبینێت. بەشێ لە میراتی ئەندێشەی هۆشەنگ ئێرانی لە لایەن سوهراب سپێهرییەوە و بەشێکی دیکەیش لەلایەن بزاڤی شیعری حجم "بارستایی" هەتا ئەمڕۆ زیندووە. من تەنانەت بیرۆکەگەلی عیرفانخوازانەی دوای دکتۆر بەراهەنی پەیوەندیار بەم مەسەلە دەبینم. ئەوەی کە بۆچی ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە لەم داب و نەریتە عیرفانییە روانگە و هەڵوێستێکی دیار و ڕوونمان هەبێ، خۆی هەوێنی باسێکی چڕوپڕ و جیاوازە و دەبێ لە کاتێکی دیکە ئاوڕی لێبدەینەوە. لێرەدا بە خراپی نازانم هێمایەك بەم مەسەلە بدەم کە بەرخوردی رەخنەگرانەی ئەو دابونەریتە عیرفانییە لە ئەدەبی ئەمڕۆی ئێمە ئەویش بەم هەموو

جوانکارییە ئاوانگاردیزمییە بووەتە یەکێك لە بابەتە  ئەسڵی و سەرەکییەکانی رەخنەکانم کە لەم دە ـ پازدەساڵەی دواییە نووسیومن و لە نێوان خوێنەران و لایەنگرانی ئەم رەوتە دوژمنانێکی زۆرم بۆ خۆم درووست کردووە. بەڵام ئەگەر مەبەستی فەرهادپوور ڕەتکردنەوەی تەواوی شیعری هاوچەرخی فارسییە، ئەمن لەگەڵ ئەو قسەیەی ئەو نیم. هەروا کە لە وەڵام بەیەکێك لە پرسیارەکانی ئێوە وتم شیعری فارسی لە دەیەی حەفتا بەدواوە، گەیشتۆتە مۆدێرنیزمێکی قوڵ و بەنرخ. شیعری ئەمڕۆی ئێمە لەچاو شیعری کۆن لەروانگەی منەوە لەگەڵ شیعری ئەمڕۆی جیهان هاوئاسۆترە.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە کۆمەڵگەی ئێمە "ئێران" بەتایبەت دوای شۆڕشی گەلان، خۆێنەران و بەردەنگانی شیعر، ماوەیەك لە شیعری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئاوڕیان ئەدایەوە و ماوەیەکیش لە شیعری ئەڤیندارانە. هۆکاری ئەم ئاوڕدانەوە و ئاوڕنەدانەوە لەم دوو جۆر شیعرگەلە لە چیدا دەبینن؟

**حافز مووسەوی:** بێگومان دەبێت لە هەلومەرجە جیاجیا و بارودۆخە جوراوجۆرەکانەوە سەرچاوەی گرتبێت. هەڵبەت من خۆم هاوڕانیم لەگەڵ ئەم جۆر پۆلینکردنانە. لەم دۆخەدا کە ئێمەی تێداین و لەڕووی ئەوەی کە حوکومەتی ئایینی لە ئێران لەسەر کۆڵەکەی ئایدۆلۆژی بیچمی گرتووە و سیاسەتمەداران بەم ئایدۆلۆژییە پشتیان بەستووە، شیعری ئەڤیندارانە زۆر لە شیعری سیاسی و کۆمەڵایەتی مەترسیدارترە. تەنگژە و لەمپەرەکانی دامودەزگای سانسۆر لە ئێران لەمەڕ شیعری ئەڤیندارانە و ئەم هەموو هەستۆکییە کە لەمەڕ وشە و زاراوەکان لەم بەشە لە خۆیان نیشانی دەدەن بەڕای من دەتوانێت ماناداریش بێت. ئەگەر ئامانجی شیعری ئەڤیندارانە پاراستنی هەرێمی تاکەکەس و شەخسیی تەواوی خەڵکانی کۆمەڵگەبێت، ئیدی کاری یەکسان سازی کۆمەڵگە کە ئامانجی تەواوی حکومەتە تۆتالیتەر و ئایدئۆلۆجییەکانە، هەرەدژوار دەبێت.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە چلەکان و سەرەتای پەنجاکانەوە، سەرەکیترین نوێنەرەکانی شاعیرە دیارەکان مینا شاملو و ئاتەشی هەڵوێست و ڕوانینێکی ئارامانخوازانە بوو. ئێوە وەك کەسێك کە



لەو سەردەمە شاعیرێکی گەنج بوون بەڵگەکانی ئەم نیگا و هەڵوێستە چۆن لێکدەدەنەوە و بەر لەم شتەش چەند نوێنەری گرینگ و ئەسڵی دیکەتان لە شیعری ئەو سەردەمەدا بەدی کردووە؟

**حافز مووسەوی:** ئەم ئارامانخوازییە لەیەک لاوە زایەڵەی پتر لە پەنجا ساڵ شۆڕش و خەباتی ئازادیخوازانەی خەڵکانی ئێران بووە کە هیچکاتێك بە سەرکەوتووییەکی ئەوتۆیش نەگەیشت و یەکێك لە نموونەگەلی ئەوانە ڕێکخراوەی میللی بە سەرۆکایەتی "دوکتۆر محەممەد موسەدیق" بوو کە لە ساڵی 1332ی هەتاوی بە شێوەیەکی دڕندانە سەرکوت کرا. لە لایەکیترەوە ئەو ئارامانخوازییە خسوسییەتی هاوبەشی بەشێکی زۆر لە ڕۆشنبیران بوو لەتەواوی جیهاندا. ئارمانەکانی عەدالەتخوازانەی سۆشیالیستی، پاڕاستنی ڤێتنام لەبەرانبەر ئیمپریالیزمی ئەمەریکا، پاڕاستنی ماقی خەڵکانی فەلەستین، دژایەتی لەگەڵ سیاسەتە نوێکانی ئیستعماری ڕۆژئاوا لە وڵاتانی جیهانی سێهەم و ...هتد شتگەلێك بوون کە بەشێکی زۆری ڕۆشنبیرانی جیهانی لەگەڵ یەکدیدا هاوبیر و یەکگرتوو کردبوو. ئەو بەشە ئارمانخوازانە کە لە شیعری شاملوو و ئاتەشی و زۆربەی شاعیرە گەورەکانی ئێمەدا سەریهەڵدابوو، لە شیعری نێرۆدا، نازم حیکمەت، ڕیتسوس و زۆر لە شاعیرانی گرینگی سەدەی بیستەم بوونی هەبوو. لەمەڕ نوێنەرە هاوبەشەکانی شیعری ئەو چاخە دەتوانین بەم خاڵە هێمایەك بکەین کە ڕۆحی گشتی شیعر لەو چاخە کەمتر تووشی گومان ببوو. ئەگەر تاقمێك وەك نیما لە دوایین شیعرەکان و فروغ لە دوو کتێبی دوایی بخەینە لاوە، شیعری ئەو چاخە شیعرێکی قایم و تۆکمە بوو. ئەم ڕۆحەگشتییە هەڵبەت لەگەڵ ڕۆحی گشتی کۆمەڵگە و ئەوشتەی کە لە شاعیرانی دەویست، لێکنزیکن. ئەم جۆر ڕوانگەیە ئەگەرچی زیانێکی زۆری وەك گشتیخوازی لەگەڵدایە بەڵام دەبێتە هۆی ئەوەی کە شیعر لەگەڵ ژیانی خەڵك و دۆزەکانی کۆمەڵگە ئاوێتەبێت. لە وڵاتێك کە شاعیرانێکی وەك حافز و سەعدی و خەیامی هەیە کە وتەکانیان کرۆکی عاتیفە و ڕۆحی بەکۆمەڵی جەماوەرەکەیەتی، چونەوەناو زەین و کەلتووری کۆمەڵگە و دزەکردن لە جەماوەر کارێکی ساکار نییە، بەڵام شاعیرانی ئێمە لەو سەردەمە ئەم کارەیان لە ئەستۆ گرت و

سەرکەوتووش بوون.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە شیعری هەندێك لە شاعیراندا، ئێمە بە جۆرێ دەگەینە ناڕوونی و پەرش و بڵاوییەکی سەیروسەمەرە کە نیشاندەری ملکەچی لە پۆستمۆدێرنیزمە. ئێوە چۆن ئەم مەسەلە هەڵدەسەنگێنن؟

**حافز مووسەوی:** ئەمەش نیشانەیەکی دیکەیە لەو قەیرانەی کە تووشی بووین. بەڵام ئەم شەپۆلە لە کاتی نوشوست هێنانیدایە. ئەو تاقمەی کە ئێستایش بە ناڕوونی و بێ سەرودەرەیی نووسین شانازیی دەفرۆشن، زۆر کەم بوونەتەوە. لەم ساتەوەختەدا هەواداران و لایەنگرانی بیرۆکە زێدەڕۆییەکانی دوکتۆر بەراهەنی کە لە حەفتاکان سەریهەڵدابوو، لەو هەڵوێستە زێدەڕۆییە، خۆیان جیاکردۆتەوە. ئەو کتێبانەی کە ئەم گرووپە چاپیان کردووە ئەم وەچەرخانە بە جوانی نیشاندەدات. بەم حاڵەیش من هەبوونی جۆراوجۆری لەشیعری ئەمڕۆی ئێران بەرەوت وپرۆسەیەکی پۆزیتیف دەژمێرم. بەشێك لەم جۆراوجۆرییە بەرێکەوت بەهۆی فەزای پۆست مۆدێرنیستی جیهانی هاوچەرخە کە چ بمانەوێت و چ نەمانەوێت سێبەرە پان و پۆڕەکەی خستۆتە سەر ژیانی ئێمەش.



**بابەک سەحرانەوەرد:** ئێوە بۆ شیعر ئەرکێکی کۆمەڵایەتی ڕەچاو دەکەن یاخود لەو باوەڕن کە شیعر ئەو کاتەی کە چووە نێو ئەم گۆڕەپانە بەرینە لە ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی، واتە شیعربوون، خۆی قوتار دەکا؟

**حافز مووسەوی:** من بە کارکردە کۆمەڵایەتییەکەی شیعر زۆر باوەڕمەندم. شیعر دەبێ لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمە کارتێکەری خۆی بسەلمێنێت. شیعری ڕاستەکی شیعرێکە کە لە باسە ئێستاتیکییەکان بانتر بڕوات و لە کەلتووری میللەتێك و تەنانەت لە کەلتووری مرۆڤیش دزە بکات. بەڵام ئەم جۆر شیعرە بێگومان شیعرێك نییە کە تەنیا لە جڤاك و رامیاری بدوێ. شیعری ئەڤیندارانەیش دەتوانێ ئەم جۆر کارکردەی هەبێ. بەم حاڵەیش من لەگەڵ ئەم وتەی ئێوە نیم کە دەبێ ئەرکێکی کۆمەڵایەتی بۆ شیعر دابین بکەین، چونکە بەیانگەری

جۆرە سنوور و بەستێنێکە کە شیعر و شاعیران لەوە وەڕسن.

**بابەک سەحرانەوەرد:** شیعر لە هەشتاکاندا زۆرتر لە دەیەی پێش خۆی لەناو ڕەوتی سیاسیدا بوونی هەبوو ئاخۆ لە شیعری ئێوەدا ئەم کارتێکەرییە بە چەشنی ڕاستەوخۆ و یان ناڕاستەوخۆ بوونی هەیە؟

**حافز مووسەوی:** بەڵێ. هەڵبەت بۆ من سیاسەت بەر لە هەشتاکانیش، بەردەوام کەڵکەڵەی شەخسیم بووە. ئێوە ئەم کەڵکەڵەیە لە خودی ناوی کۆمەڵە شێعری "شیعرگەلی کۆماری" کە زۆربەی شیعرەکانی لە نیوەی ئاخری دەیەی حەفتا نووسراون، دەتوانن ببینن.

**بابەک سەحرانەوەرد:** کەمێکیش لە ئەدەبی مەنفا و تاراوگە بدوێین. هەندێك لە ڕەخنەکاران لەسەر ئەو باوەڕن کە لەم سێ دەیەی دواییدا شاعیرە ئێرانییەکان نەیانتوانیووە لە تاراوگە بەرهەمێکی پەسەند و بەنرخ بەرهەم بهێنن. ئاخۆ ئێوە لەگەڵ ئەم باوەڕەدا کۆکن یان تێڕوانینی ترتان بۆی هەیە؟

**حافز مووسەوی:** تا ئەو جێگایە من شارەزام، چیرۆکنووسانی تاراوگەنشین لە شاعیرەکانمان گەلێ سەربەرزتر خۆیان نیشانداوە. هەڵبەت لەشیعری تاراوگەیش نەوەیەکی جیددی لە شاعیران سەریانهەڵداوە کە لە کەلتووری ڕۆژئاوادا پەروەردەبوون و کەمتر خەمخۆری دابونەریتە ئەدەبییەکانی خۆمان بوون. لە کاری ئەم شاعیرانە هەندێجار تریشکەگەلێك دەبینرێت و بەدی دەکرێت کە دەتوانێت مزگێنییەك بێت بۆ تەواوی شێعری فارسی.

**بابەک سەحرانەوەرد:** تێڕوانینتان بۆ بەرهەمی بەرەی نوێ لە بواری شیعردا چییە؟ ئاخۆ فریا دەکەوی شیعرەکانی ئەم نەوەیە بخوێنیتەوە؟ یەکێك لە شاعیرە گەنجەکان وتبووی کە نەوەی من "مەبەست نەوەی نوێ و گەنج"ە، نەوەیەکی تایبەتە کە لە نەوەی پێش خۆی زۆر جیاوازتر لە شیعردا هاتۆتە ئارا. ئاخۆ ئێوە ئەم جیاوازییە لە شیعری نەوەی گەنجدا دەبینن یان ئەمەیش لەو

دروشمانەیە کە هەندێك لە شاعیران هەر دەیڵێن و دەیڵێن و زوش لەیاد دەچن؟

**حافز مووسەوی:** من لەگەڵ هەندێکی زۆر لە شاعیرە گەنجەکان پەیوەندی و دۆستایەتیم هەیە و پتر دەفتەرە شیعرەکانیان کە بڵاودەبێتەوە و دەگاتە دەستم دەیانخوێنمەوە. ئەو ڕێیە گشتییەی کە نەوەی نوێ بەسەریدا هەنگاو دەنێ، بەڕای من ڕێگەیەکی پەسەندە. بەتایبەت شیعری ژنان لە بواری چۆنایەتی و چییەتی زۆر پەرەی سەندووە. بەڵام ئەمە بەمانای دامەزراندنی گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ و ناوەکی لە چۆنایەتی شیعردا نییە. هەڵبەت من هێشتا هەبوونی ئەم جۆر کارەم هەست پێ نەکردووە. ڕەوتێك کە لەم دوو دەیەی دواییدا لە شیعری فارسی دەسپێکرابێت، تا ئێستا نەگەیشتۆتە ئاستێکی پڕبوون و ئێستاکەیش زۆری ماوە بەو گەشەسەندنە بگات کە باسم لێکردن.

**بابەک سەحرانەوەرد:** بۆ کۆتایی دانهێنان بەم دیمانە، باس لە دوایین بەرهەم و نووسینەکانتان بکەن. ئاخۆ ئێستاکە سەرقاڵی نووسینی بەرهەمێکی تایبەتن؟

**حافز مووسەوی:** ڕاستییەکەی ئێستاکە سەرقاڵی کۆکردنەوە و داڕشتن و سەر و سامان بە وتارەکانم کە لەم 10ـ15ساڵەدا نووسیومن. بەشی یەکەمی ئەم وتارگەلە کە لەواقیعدا بەرگی دووهەمی کتێبی "پانووسەکان"ی گرتۆتەوە، ئامادەی چاپە. وتارەکانی تریشم کە دەقگەلێکن لە بواری کەلتوور و ئەدەب لە یەك بەرگدا پێکهاتوون و بەزوویی چاپ دەبن. هەڵبەت شیعرنووسین هەروەك جاران یەکەمین داڵغەی سەرەکیم بووە. بڕیارمداوە دوای سەروساماندان بە کۆوتارەکانم، زۆربەی کاتم لەبۆ شیعر تەرخان بکەم. ئەم ڕۆژانە و ڕەنگە لەم تەمەنەدا کە من تێیدا ئەژیم، هیچ کارێکی دیکە بە قەد شیعر بۆ من بەنرخ و پەسەندنەبێت و ڕازیم ناکات.



## حەوت نموونە لە کورتە شیعرەکانی حافز مووسەوی

**1**

چۆلەکەکان هاوڕێتن
پشیلەکان لە ترپەی پێی تۆ ناتۆقن
قالۆنچەکان
ـ ئەگەر تۆ بتەوێت ـ
لەپاڵ سەرپێییەکان ڕاکشاون
گیانلەبەری دەروونم هێمن بۆتەوە
تۆ بە کام زمان دەدوێیت؟!

**2**

خولیاکانت درێژبوون
دەستەکانی من کورت
تۆ پەیژەت دەویست
من ئەسکەمێل
بەم هەمووەیش

فەرامۆشم مەکە
کاتێ لەسەر ئەسکەمێلە کۆنەکە دانیشتووی و
بیر لە مانگەشەو دەکەیتەوە.

3

کەشتییە ئەنتیکەکانی ئێوە
لە ئاوەکانی مندا ڕاوەستاون
هێشتایش، دەریاوانە بەساڵاچووەکان
مەیخانەکانی فنقییەیان چاك لەبیرە
شەوە پڕ ئەستێرەکانی بەغدا
دەهێنمەوە بیرتان و
کچەکەم، شەهرەزاد
کە تامی حیکایەتەکانی هێشتایش
لە ژێر پێڵووەکانی ئێوەدا شاردۆتەوە؛
زەردەشت، مووسا، مەسیح، محەممەد
کوڕانی منن و
کەنیشکەکانم
مەریەم و هاجەر
دوو مانگەشەون لە هیلالی خەسیبدا
بە چاوی سووکەوە سەیرم مەکەن
ئەمن ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستم.

4

لە پایتەختی حیکایەتەکانی هەزار و یەك شەودا
دیکتاتۆریان لە سێدارەدا
سەلیم پاشا
بۆ دامەزراندنی کامووسی ئیمپڕاتۆری
بۆ هیلالی خەسیب سەفەری کرد



شاعەبباس
بۆ لەندەن پەیامی نارد
عەبدول وەهاب
بە سەر نەخشەکەی پێدەشت چەمایەوە
هەتا شوێن پێی تورك و گاورەکان
نیشانی ئینگلیزییەکان بدات
ئێرە
رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە
وڵاتی ئاشتییە کاتییەکان
لە نێوان شەڕە یەك لەدوای یەکەکان
وڵاتی خەلیفەکان، ئیمپڕاتۆرکان، شازادە و حەرەمسەراکان و
جەماوەرێك کە نازانن
بۆ لەسێدارەدانی دیکتاتۆڕێك
دەبێ شین بگێڕن یان بێنە پێکەنین؟

**5**

پایز، پەیڤێکی تازەی بۆ وتن پێ نییە
بەم هەمووەیشەوە
لە مینبەرە بەرزەکەی "با"دا
قسە تووڕ دەدا
دارەکان چ زوو و دڵناسکانە دەکەونە گریان!

**6**

ناوەکانتانم
لەسەر ئەم شێعرە نووسیوە
ئاخ و داخەکانتانیش..
با لەمە تێپەڕین..
بڕیارمان
سێ شەممانە
لەگەڵ دوو ئەسکەمێڵی بەتاڵ.

**7**

هاتبوومە خوراسان
کە چاوەکانی ئێوە بنووسمەوە
بەڵام ئێوە لەوێ نەبوون
خوراسانەکەتان
ئێوارەی چاوانی منە
سەیر نییە؟!
ئەم شەقامە کۆنە، بەم هەمووە قەرەباڵغییەوە
هیچ کەسێکی
ئاشنای ئێوە یا منی تێدا نییە،
من ڕێگەی میوانخانەم ون کردووە و
تا دوایین شەمەندەفەر، دەبێ
هەروا بۆ خۆم
چاوەکانتان دەور کەمەوە.





# بە شوێن ئەو پەیڤە تەنیایەدا

## بەرۆژ ئاکرەیی

یەدوللا ڕوئیایی"ڕۆئیا" لە ساڵی ١٩٣٢ و لە کۆنەقەڵایەکی شارێکی هەڵکەوتوو لە بەستێنی زەریای خوێدا چاوی بە ژین هەڵێناوە. کە لێی دەپرسن ڕووداوە گرنگ و کاریگەرەکانی ژیانت کامانەن؟ «ڕووداوەکانی ژیانی "ڕۆئیا" هەر ئەوڕووداوانەن کە لە تەمەنی هاوجیلەکانی ئەودا ڕوویان داوە، لەو نێوانەیشدا، شتگەلێك کە کاریگەرییەکی قووڵیان خستۆتە سەر دۆخ و دەروونی ئەو، خۆش و ناخۆش، لە زەینیدا ماونەتەوە و ئێستایش پەرە بە هەبوونی

خۆیان دەدەن. وەکو:
- کۆدەتای ١٩٥٣ و کەوتنی "مسدق".
- لە سێدارەدانی "ئەفسەرانی حیزبی توودە" و ئاشکرابوونی تاوانەکانی "ستالین" لە پەنجاکاندا.
- کۆمەڵکوژیی سوورپێستەکانی ئەمریکای باکوور.
- ڕووداوەکانی مانگی ڕێبەندانی ١٩٧٩ و شۆڕشی ئیسلامیی ئێران.
- لابردنی دیواری بەرلین و ڕووخانی یەکیەتی سۆڤییەت.»١

بەڵام ڕوئیایی، لە تەمەنی مێردمنداڵیی و گەنجێتیدا خەریکی سیاسەت و مارکسییەت بووە. دوای کۆدەتاکەی ١٩٥٣ لە شارەکەی خۆی هەڵاتووە و ماوەیەک خۆی شاردۆتەوە. پاشان دەستگیر کراوە و کەوتۆتە زیندان. دوای ئازادبوونی لە زیندان، لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا دەستی بە شیعرنووسین کردووە و شیعرەکانی بە ناوی "ڕوئیا" بڵاو بوونەتەوە. خوێندنەکەی لە زانکۆی تاران تەواو کردووە و دکتۆرای مافی نێونەتەوەییشی هەر لەو زانکۆیە وەرگرتووە.

«ڕووداوەکانی دیکەی ژیانی ڕوئیا، لە نێو ژیانەکەی تری ئەو ـشیعرـ دا دەناسرێنەوە. چونکە شیعر خۆی ڕووداوێکە و هیچ ڕووداوێکیش لە بڵاوکردنەوەی ڕووداو، مەزنتر نییە[...] یەکەمین شیعرەکانی من، یەکەمین سەرینەکانی من بوون لە شیعردا. لە بەرزەفڕیدا پەلەقاژەم دەکرد و سەرم لە ئەزموونی جۆراوجۆرەوە دەردێنا. ئەوەی زۆرتر جەزمی دەکردم، پشکی هونەری پەیڤین بوو لە شیعردا و بەدواداگەڕانێک لە شێوە و کەشفکردنی هۆکارگەلە سازەندەکانی. هەر لە هەڵبەستی "لە جادە چۆڵەکاندا" تا "گەڵاڵەکان"، ژیانی پەیڤ و چاکترین شوێنی پەیڤ لە ڕستەدا، ژینی دێڕ و باشترین شوێنی دێڕ لە فەزای هەڵبەستدا، کە دەیگەیاندمە دۆزینەوەی کێشە تازەکان و بەهرە نوێیەکانی پەیڤ و دیتنەوەی ڕێیەک لە شیعردا بۆ پیادەکردنی هۆکارگەلێک کە لە هەموو هونەرەکانی دیکەدا ڕۆڵێکی جوانناسانەیان هەیە. واتا هەمان ئەو هێڵە هاوبەشانەی بۆ نموونە لە نیگارکێشی یان مۆسیقادا، شێوەساز و جوانییبەخشن. ئەمانە لە شیعریشدا، دەبا شوێنێکیان بۆ دەرکەوتن و نواندن هەبوایە.»٢

ڕوئیایی لە ساڵی ١٩٦١دا یەکەمین کۆمەڵەشیعری خۆی لە جادە چۆڵەکاندا بڵاو کردەوە.



که وێڕای کاریگەریی نیما، دەنگ و دیدێکی تازە و دیکەی هێنایە نێو شیعری فارسییەوە.

«من سەرەتا، گەلێك بە "نیما" سەرسام بووم و ئەم کارتێکەری و سەرسامییەیش، لە کۆمەڵەشیعری "لە جادە چۆڵەکاندا" دەبینرێ. بەڵام دواتر سەرسامییەکانی دیکەی خۆم، هێدی هێدی منیان لەژێر کارتێکەری نیما دەرهێنا و دوور خستەوە. سەرسامبوون حاڵەتێکی نائاگایی هەیە. من کە شیعری نیماییم دەگوت، پێم وابوو شیعری من شیعرێکی ڕەسەنە و کەسایەتیی خۆی هەیە. بەڵام ئێستا کە دەگەڕێمەوە و دەیانخوێنمەوە، شوێنپێی نیمایان تێدا دەبینم. هاموشۆی من لەگەڵ نیمادا و خوێندنەوەی سەرلەبەری شیعرەکانی ئەو لە پەنجاکاندا، کە سەرەتای شاعیرییم بوو، منی سەرسامی زمان و میکانیزمەکانی خەیاڵی ئەو کردبوو. دواتر کە زمانی فەرەنسییم خوێند و ئاشنای شیعری "ڤالێری" بووم، شیعری ڤالێری ڕایکێشام و کەوتمە ژێر کاریگەریی خەیاڵ و نیگای ئەو شاعیرەوە. دەڵێم خەیاڵ و نیگای ئەو، چونکە زمانی ئەو فارسی نییە و من ناتوانم بکەومە ژێر کاریگەریی زمانی ئەوەوە.»٣

"دەریاییەکان" دووهەمین کۆمەڵە شیعری ڕوئیاییە، کە تا ئەمڕۆیش شاعیر و ڕەخنەگر و خوێنەرانی شیعری فارسی بە خۆیەوە خەریك کردووە.

«من، دوای ڤالێری، بە "سێن ژۆن پرێس" سەرسام بووم. بینیم کە لای سێن ژۆن پرێس، خەیاڵ و شیعر، ژینێکی دیکەیان هەیە. ئەو یارییانەی کە بە زمانی کردووە و ئەو فڕینەی کە بە نیگای خۆی بەخشیوە و ئەو دیدەی لە جیهانی بڕیوە، ئەمانە سەرلەبەر منیان گۆڕی. من لە دوالاپەڕەکانی "دەریاییەکان"دا، ئاماژەیەکم بە کارتێکەریی سێن ژۆن پرێس کردووە. ئێستا ئیدی ژیانی ساڵانی شاعیریم بە زمانی فارسی، پێم دەڵێ کە چ ڕاسپاردەیەکم بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی سەردەمی خۆم هەبێت. "هایدگەر" دەڵێ: "زمان ماڵی هەبوونە." کەواتە هەبوونی شاعیر لەو شوێنەدا دەخوڕێ، کە داروپەردووی ماڵەکەی خۆی بە دەستی خۆی هەڵچنیبێت.»٤

ڕوئیا هەر لە سەرەتای نووسیندا و بە پێچەوانەی زۆربەی شاعیرانی

ئەو سەردەمە، ڕێچکەیەکی تازەی لە هۆنینەوەی شیعردا گرتە بەر و شیعری نوێی فارسی بەرەو ئاقارێکی دوورەدەست و نوێ برد. ئاقارێك کە پەیڤ خەیاڵ و خەیاڵیش پەیڤ لەوێ لەخەو هەڵدەستێنێ.
«... ناوەڕۆك لەگەڵ بەدیهاتنی فۆرمدا دێتە دی. من بەر لەوەی بمەوێ شیعرێك بهۆنمەوە، بیر لە هیچ ناکەمەوە، واتا ناواخن و ناوەڕۆکی شعیری من لەگەڵ بەدیهاتنی فۆرمدا دێتە دی... ئەمە هزرەکانی من نین کە لە سەرمەوە دەڕژێنە سەر لاپەڕە. بە پێچەوانەوە. پێم وایە شتێك کە من دەینووسم، هزرگەلێکن کە لە لاپەڕەدا هەڵدەستنە سەر پێ، نەك لە سەرمدا. من پێم وایە ئەو شیعرەی خەریکم دەینووسمەوە، میراتێکە و بۆ خوێنەری بە جێ دێڵم کە دواتر بیبینێتەوە و تێی بگا. کە دەڵێم ئەمە میراتێکە و بۆ خوێنەری بە جێ دێڵم کە بیبینێتەوە و تێی بگا، مەبەستمە بڵێم: خوێنەر تێگەیشتنی خۆی لە شیعری من هەڵدەهێنجێنێت. واتە ئەویش بە شێوەیەك لە داهێنانی شیعری مندا بەشدارە. ئەو شیعرەی خستوومەتە بەر دەمی خوێنەر، لەوانەیە ڕێك ئەو شتە نەبێت کە من ویستوومە و مەبەستم بووە[...] چونکە خوێنەریش شیعر بۆ خۆی شرۆڤە دەکات و خۆی بە شاعیر دەبینێت. واتا دەبینێ کە لە شیعردا هەبوونی هەیە. کەواتە: من هیچم بە سەر خوێنەردا نەسەپاندووە...»٥



دڵتەنگییەکان لە سەردەمێکدا بڵاو دەکرێنەوە، کە ڕوئیایی گومان لە شیعر دەکا و زمان و خەیاڵی گیرۆدەی جادووی پەیڤ دەبن و بۆ دۆزینەوەی ڕەچەڵەکی پەیڤیش، لە داهاتووی پەیڤ ڕادەمێنێ.
«شێعر هەمیشە بەرهەمی ئەزموونەکانی خودی مرۆڤ نییە. شیعر سەرلەبەری پەیڤە. دەبێ ڕەفتاری پەیڤ، کرداری پەیڤ و سروشتی پەیڤ بناسین و خودی پەیڤ بین. چاکترین هاوڵێیەکان لەگەڵ پەیڤدا، چاکترین شیعریان لێ هاتۆتە بەرهەم.»

کۆمەڵە شیعری لە خۆشمدەوێیەوە زمانی و خەیاڵ بەرەو لەش، لەشی سەرکوتکراو و قەدەغە دەبا. ئیرۆتیزم:

قسە لە تۆ لە بە ئارامی
قسە لە تۆ لە بە تۆ گوتن

قسە لە تۆ لە بە ئازادی

کە لە تۆ دەڵێم
لە عاشق
لە عارفانە
دەڵێم
لە حەزم لێیە
لە لێ دەبێ
لە هزری تێپەڕین لە دەرکەوە بە تەنیایی.

من بە گوزەر لە دڵی تۆ دەمکرد.
من بە سەفەری ڕەشی چاوی تو جوانە
دەژیم.
من بە لە ئارەزووی تۆ
دەمێنمەوە.
من بە گوتن لە تۆ
دەچڕمەوە.

ساڵی ١٩٦٩ڕوئیایی و چەند شاعیرێکی لاوتر لەخۆی مانیفێستی شیعری بارستایی بڵاو دەکاتەوە. ئەم مانیفێستە گەلێك دەنگی یار و نەیاری لە ئاست ڕوئیایی و شاعیرە هاوبیرەکانی بەرز کردەوە کە زایەڵەیان تا ئەمڕۆیش دەزرنگێتەوە. "ئەم مانیفێستە لە لاپەرەکانی کۆتایی ئەم باسەدا خراوەتە بەرچاو."

کۆمەڵە وتاری: فەوتانی ئاوەز لە کاتی بیرکردنەوەدا نیشاندەری ڕاوبۆچوون و تیۆرییەکانی ڕوئیاییە کە لە ساڵی ١٩٧٨دا بڵاو کراوەتەوە لەو سەروبەندەدا گۆڤار و ڕۆژنامەکان پڕن لە تەپوتۆزی سینگدەرپەڕاندنی شاعیرانی ڕۆژ. ئیلتیزامفرۆشتن لەو سەردەمەدا دراوێکی سواوە و هەموو کەس لە هەموو شوێنێکدا خەرجی دەکا و نەڕەنەڕی بۆش و بەلاشی شاعیران، شیعری هەرزان کردبوو:
«... با واز لە شیعری مولتەزیم بێنین و لەباتی قسەی لەم چەشنە، ددان بەوەدا بنێین کە شیعر بەر لەوەی مولتەزیم بێت، دەبێ مولتەزیم بکات. شاعیر ئەگەر شاعیرە، دەروونی لە ئاست هەموو کێشەکانی ژیان و جیهانی دەوروبەریدا هەستیار و بێدارە. شاعیرێکیش کە دەروونێکی وەرگر و

ڕاستگۆی لە ئاست ژینی زەمانەدا نەبێت، شاعیر نییە. کەواتە دەبێ لە دەروونی مولتەزیم بدوێین، نەك لە شیعری مولتەزیم. کە دەروون مولتەزیم بوو، ئەو شیعرەی لەو دەروونەوە هەڵدەقوڵێ مولتەزیم نییە، مولتەزیمگەرە. باسی کام ئیلتیزام دەکەن؟ ئیلتیزامە ئاراستەکراوەکان؟ ئیلتیزامگەلێك کە ڕۆژنامەکان و ئایدیۆلۆژییەکان و حیزبەکان و پارت و ڕێکخراوەکان دەستنیشانیان دەکەن و دەیخەنە بەرچاو؟ یان قسە لەو ئیلتیزامەیە کە دەروونی خۆت پێشانی خۆت دەدا؟ هەر باسی ڤیەتنام و ڕەشەکان و فاشیزم و ئاشتی دەکەی، چونکە هەموو کەس هەر باسی ئەم شتانە دەکەن. شیعر ڕاپۆرت یان گێڕانەوە نییە، گوتنی شیعر، گوتنی ئەو شتە نییە کە هەیە، بەڵکو گوتنی ئەو شتەیە کە نییە و شاعیر دایدەهێنێ و پێشکەشی دەکا.»٨

ڕۆئیایی گفتوگۆ و وتارەکانی لە سەکۆی سوورەوە "کێشەکانی شیعر: گوتوبێژەکان" بڵاو دەکاتەوە. لەم وتار و گفتوگۆیانەدا، ڕۆئیایی بە زمانێکی چڕ و گەلێکجار دڕ، بارە نالەبارەکانی سیاسەت و هەرا و زەنای زەمانە لە شانی شیعر و شاعیر دادەگرێ و شیعر تەنیا بەرەو هەواری شیعر تاو دەدا:

«زمانی هەرکەسێك خودی ئەو کەسەیە. زمانی شاعیر ئەو کاتە دەرسکێ کە خوێنەر بە ڕوخساری شاعیر بگەیەنێت، بە ڕوخساری فیزیکیی شاعیر. چۆن دەکرێ بەم ڕسکانە بگەین کاتێك شاعیر خۆی بە زمان نەبەخشیبێت؟[...] مرۆڤ دەمێکە ئیدی لە داهێنان و دۆزینەوەکانیدا لاسایی سروشت، لاسایی ڕاستەوخۆی دەرکەوتە فیزیکییەکانی سروشت ناکاتەوە و بە شوێن دۆزینەوەی پەیوەندییە پەنهانەکانی نێو دەرکەوتە فیزیکییەکاندا عەوداڵە. لە پیشەسازییدا، بۆ هەڵگرتن و گواستنەوە لاسایی دەستی کردۆتەوە "کرێن". بەڵام بۆ لاساییکردنەوە لە ڕۆیشتن، کە بیری لە لاق کردۆتەوە، چەرخی داهێناوە کە دەرکەوتەی دواهۆکاری ڕۆیشتنە، لە پێ ناچێ و لاساییەکردنەوەی ڕاستەوخۆی سروشتیش نییە. لاسایی ئەو دوادەرکەوتەیە کە حیکمەتی هەبوونی لاق دەخاتە بەرچاو و دەرەنجامی لە ئارادابوون و جووڵەی پێیە.» ٩

ڕۆئیایی هاوجیل و هاودەم و هاوکاری شاملوو و فروغ و ئەخەوان و ڕەحمانی و سپێهری و... زۆربەی شاعیرە ناودارەکانی شیعری فارسی بووە. لەگەڵ فروغ فەرروخزاد دا پەیوەندییەکی



نزیك و دۆستانەی هەبووە و شیعری هاوبەشیان پێکەوە نووسیوە. لەگەڵ شاملوودا و لە شەستەکاندا، گۆڤارێکی ئەدەبی بە ناوی "بارو" (هەم بە مانای قەڵا، هەم وشەیەکی پێکهاتوو لە "با"ی "بامداد" ـ نازناوی شاملوو لەو کاتەدا ـ و "رو"ی ڕوئیایی) بڵاو کردۆتەوە کە دواتر لەلایەن ساڤاکەوە ڕاگیراوە.
ڕوئیایی، دوو ساڵ بەر لە شۆڕشی ئسلامیی ئێران ١٩٧٧، لەگەڵ "مادلێن"ی هاوسەریدا، ڕووی لە فرەنسە کرد. لە ساڵی١٩٩٠ دا (دوای دوازدە ساڵ بێدەنگی) کۆمەڵەشیعری لێوڕێژەکان "شیعرەکورتەکان"ی لە پاریس بڵاو کردەوە:
«لێوڕێژەکان دواخاڵی دوازدەساڵ بێدەنگی بوو، ناسنامەی بەو بێدەنگییە دەدا. گەر "لێوڕێژەکان" نەنووسرابان، ئەم دوازدەساڵ بێدەنگییە، بێدەنگ دەمایەوە. دەپرسی: بۆ دوازدەساڵ بێ شیعر؟ چ پرسیارێ! کە وەڵامەکەی خۆی پرسیارێکی دیکەیە: بۆچی دوای دوازدەساڵ، شیعر؟ ئەم پرسیارە هاوسەنگییم دەداتێ، بۆ ئەوەی هاوسەنگیش بیت، دەبێ پێچەوانەی ئەوە بیت کە بوویت، دەنا هاوسەنگبوونی خۆت لەدەست دەدەیت، لە زماندا هەروەك لە ژیانیشدا. شۆڕش دەرسێکی سەخت و چەتوون بوو. ئادۆرنۆ دەیگوت: "دوای ئاشڤیتس، شیعر ئیدی هیچ پاساوێکی نییە". ئەو شیعرەی ئادۆرنۆ دەیناسێ، بەڵێ، هیچ پاساوێکی نییە. دوازدەساڵی برد تا لەمە حاڵی بووم: ئێمە "خەڵکی دنیا" شیعرمان نەبووە، گەر هەمان با، ئاشڤیتسمان نەدەبوو.» ١٠

هۆنینەوە، لەوانەیە چاکترین ناو و وەسپی شیعری ڕوئیایی بێت. هەر بۆیەیش ڕوئیایی جیا لە شیعر، تەمەنێك خەریکی تیۆریزەکردنی شیعر و پرۆسەی نووسین و خوێندنەوە بۆ شاعیران و خوێندنەوە و نووسین بۆ خوێنەران بووە:
«... خوێنەرانێك هەن کە لە تاریکیدا شیعر دەخوێننەوە، خوێنەری دیکەیش هەن کە شیعر لە تاریکیدا دەخوێننەوە. خوێندنەوە، شێوازی خۆی گەرەکە. خوێندنەوە هونەرێکە، کە دەبێ پشکەکەی لە شیعر و بە گشتی لە ئەدەبدا، لە بەرچاو بگیرێ. خوێنەری جیددی لە پەراوێزی ئەو شتەدا کە دەیخوێنێتەوە، کارگا و کەرەسەی تایبەتیی خۆی هەیە. خوێنەرێك کە بۆ خوێندنەوەی دەق، کارگا

و كەرەسەی خۆی نەبێ، خوێنەرێكی ناتەیار و ڕەمەكییە. خوێنەری تەیار، بە پێچەوانەوە، دێڕە نەنووسراوەكان دەخوێنێتەوە، نێوان دێڕەكان دەخوێنێتەوە. بەم شێوەیە، خوێندنەوەیش دەبێتە شێوەیەك لە داهێنان، لە ئەفراندن. خوێنەرێك كە نانووسێ، بەڵام خۆی دەبێتە دەقێك بۆ خوێندنەوە. ئەم شێوە خوێندنەوەیە، دەسەڵاتی خوێندنەوەیە. دەسەڵاتی خوێنەریش، دەسەڵاتی خۆپارازتنە لە دەسەڵات.» ١١

ڕوئیایی شاعیری شیعرە چڕ و ئەستەمەكانە. ئاماژەی بۆ جیهان و دەڤەر و دەوروبەری لە نووسیندا، ئاماژەیەكی خێرایە و مەوداكان ون دەكا، یان بە پێزانینەوە بەرجەستەیان دەكا بەڵام لەودیویان دەدوێ. نەك لە هۆیەكانی، بەڵكو لە هۆكار و دەرەنجامی هۆكارەكانی. ڕوئیایی مەوداكانی نێوان بیر و ڕوانین لە شیعردا هەڵدەگرێ و خەیاڵ بەرەو ئاقارێ دەفڕێنێ كە زۆرجار لەوێدا ون دەبێ. بەڵام، ئەمە ڕێك مەبەستی ئەوە.

بەرهەمەكانی دیكەی ڕوئیایی بریتین لە:
شیعری بارستایی، شیعری بزاڤ١٩٩٥ كۆمەڵەشیعر/ بە زمانی فرەنسی و لە وەڵامی پێشنیاری شاعیری فرنسی بێرنار نۆئێلدا: شیعر چییە؟
ئیمزایەك لەسەر پشت ١٩٩٦ كۆمەڵەشیعر/ ئنگلیزی
كەواتە مەرگ شتێكی تر بوو ١٩٩٧ كۆمەڵەشیعر/ فرەنسی
درێژایی ڕێ، قوربانیی وڵاتم كۆمەڵەشیعر/ سوئێدی
حەفتا كێل ١٩٩٨
ئیمزایەكان ٢٠٠٠
بەشوێن ئەو پەیڤە تەنیایەدا ٢٠٠١ كۆمەڵە شیعر
باس لە چییە ٢٠٠٧ كۆمەڵە وتار و چاوپێكەوتنەكان
ڕووخساری پەنهانی پەیڤ ٢٠١٢ كۆمەڵە وتار



پەراوێزەکان:

١. نامەیەك بۆ سینا ڕوئیایی: ١٩٩٩
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣. شەریعەتی شیعر. کتێبی "لە سەکۆی سوورەوە"
٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٥. گفتوگۆ لەگەڵ ڕادیۆی B.B.C زستانی ١٩٩٢
٦. ڕۆژنامەی کیهان ١٩٧٦
٧. "لە سەکۆی سوورەوە"
٨. ڕۆژنامەی آیندگان ١٩٦٩ لە وەڵامی "خسرو گلسرخی" دا.
٩. "لە سەکۆی سوورەوە"
١٠. هەڵبژاردەی شیعرەکان / پێشەکی ٢٠١٠
١١. گۆڤاری کارنامە. پاریس. ١٩٩٨

## دەقی مانیفێستی شیعری بارستاییگەری

«بارستاییگەریی کەسانێك لە یەکدی کۆ دەکاتەوە کە لەودیوی ڕاستیینەکانەوە، سۆراخی پەیبردنە ڕەها و دەسبەجێ و نەسرەوتەکان دەکەن. تینوویەتی ئەم پەیبردنەیش، گشت سۆراخکردنەکانی دیکەی لەواندا پووچەڵ کردۆتەوە.
ڕەهایە چونکو لە حیکمەتی هەبوونی ڕاستیینە و لە دواهۆکاری ئەودا سەری هەڵداوە و لە خۆنواندنیشدا، خۆی لە ڕاستیینەی ماك، ئاشنا ناکا.
دەسبەجێیە چونکە شاعیر لە گەیشتنیدا بە پەیبردن، لەو بارستاییەی کە لە نێوان پەیبردن و ڕاستیینی ماکدا هەبووە، نەك لە درێژاییییەوە ـ بەپەلە بازی داوە، بێ ئەوەی هیچ شوێنپێ و نیشانەیەك لەدوای خۆی جێ بهێڵێ.
نەسرەوتە چونکو لە سۆراخکردنی بارستاییەك بۆ بازدان، جەزمی با ر ستا ییگە لێکی

دیکەیە کە تینوویەتی دۆزینەوە و بازدان دەدەن.
ئەم قسەیە تێڕامانێکی گەرەکە:
لە ڕاستیینەوە تا نیشانەکانی ڕاستیینە، لە شتەکانەوە تا شوێنپێی شتەکان، مەودایەك هەیە. مەوداگەلێك لە ڕاستیینەوە تا ئەودیوی ئەو. مەوداگەلێك لە ڕاستیینەوە تا ئەوپەڕی ڕاستیینە. لە هەزار خاڵی شتێکەوە، هەزار ترووسکە دەتریسکێنەوە. هەر ترووسکەیەك بە نیشانەیەك لەودیوی ئەو شتە دەگا، ڕاستیینەیش یان نیشانە هەزاربەهەزارەکانی ڕاستیینە، پەیوەستی هەزار ڕەهەندی دیکە دەبن. شاعیری بارستاییگەر، ئەم مەودایە بە قەڵەمبازێك دەبڕێ، خێرا و دەسبەجێ. بەم چەشنەیش، لە ڕاستیینەوە بە سوودی نیشانەکانی ڕاستیینە، هەڵدێ. هەر نیشانەیەکیش کە هەڵبژێرێ، لە ڕەهەندێکەوە باز دەدا، کە لەنێوان ڕاستیینە و نیشانە هەڵبژێردراوەکەیدایە. لە هەر ڕەهەندێکیشەوە کە باز دەدا، لە پانتایی، لە درێژایی و لە قووڵاییەوە باز دەدا. کەواتە لە بارستاییەوە باز دەدا، کەواتە بارستاییگەرە. چونکە بازدانی گەرەکە و سۆراخی دۆزینەوەی بارستایی دەکا.
سپاسمانتالیسم، سورڕیالیسم نییە. جیاوازییەکەی لەوەدایە کە لە سێ ڕەهەندەوە دەگاتە ئەودیو. لەم گەیشتنەیشدا تەنیا لە شوێنێکدا بە یەکدی دەگەنەوە: لە بازدان لە درێژاییەوە. هەرچەند لێرەیشدا بازدانەکە دەسبەجێترە.
بارستاییگەر لەم بازدانەدا شوێنپێیەك لە خۆی جێ ناهێڵێ. لە پشت وێنەکەی ئەودا سێ ڕەهەند بڕدراون، ئەم سێ ڕەهەندە بڕدراوەیش، لەنگەرگایەك دروست دەکەن تاکو خوێنەر، شیعری بارستایی بگەیەنێتە شوێنێك کە شاعیر پێی گەیشتووە.
خوێنەری تامەزرۆ، هێدی هێدی فێری تێپەڕین لە لەنگەرگا دەبێ و خوێنەر گیرۆدە دەبێ. گیرۆدەی چڕوپڕی، گیرۆدەی گەیشتن بە ئەودیو، بە تێپەڕین لە بارستایی، بە گەیشتن بە شوێنەی کە شاعیری بارستاییگەر پێی گەیشتووە. لەوێ شاعیر بۆ گوتن، قسەیەکی نییە. شیکردنەوەیەکی نییە و لە ناکاو شتێك دێنێتە سەر زار کە سەمەرە و ڕازە. هەر ئەو شتەی کە جادووگەران، پەیامبەران، ڤێداخوێنان، بەرەهمەنان، پەیامهێنەرانی کفر و پەیامهێنەرانی ئیمان هێناویانەتە سەر زار، واتا شیعر، خودی شیعر.



بارستاییەگەری نە ئۆتۆماتیکە و نە بەدەست خۆت. جەزمگەلێکی ئیرادییە، یان ئیرادەیەکی جەزمکراوە. جەزمەکەی لە جوانییە. لە جوانناسییە. ئیرادەکردنەکەی لە شۆر و شعوورە و، لە تەمای فۆرم و لە دڵبەستنە بە چارەنووسی شیعر.
نە هەوەسە، نە خۆڕانان. ترپەیەکی قەڵس و تووڕەیە. ترپەی وشیار بۆ هونەری شاعیریی لە مرۆڤێکی شێتی شیعردا، کە بڤە دەکا، کە لە قوربانی بوون ناترسێ.
شیعری بارستایی، شیعری قسەی جوان نییە؛ شیعری پێگەیشتووە؛ لە پێگەیشتنیدا کێویە و لە دۆزینەوەی جوانییدا توندوتیژە.
ئانتیك نییە بەڵام لە بۆنی کەونارا بێدار دەبێتەوە. شوێنگۆڕکێی ڕاستیینەیش نییە. لە ژیانی ڕۆژ و لە زمانی کۆڵاندا ڕاناوەستێ. شاعیری بارستاییگەر، هەمیشە بە تەمایە کە ڕاستیینەیەك بهێنێتە دی، ڕەسەنتر و بەگوڕتر لە ڕاستیینەی ڕۆژانە و ئاسایی:
ئێمە وێنە لە شتەکان نابەخشین؛ ڕوانگەیەك لە دواهۆکارەکەی دروست دەکەین. هۆکارگەلێکیش کە بەم چەشنە قەرزیان دەکەین، لە شوێنێکی دوورەدەست و بە مەودایەك لە ڕاستیینەدا دایاندەنێین.

کاری شیعر، گوتن نییە؛ داهێنانی پارچەیەکە؛ واتا شیعر دەبێ خۆی بابەتی خۆی بێت.
ڕەوانبێژی و پشکنینە زمانییەکان خەونی ئێمە نییە؛ بەڵام جادوی سەمەرەی پەیڤەکان لە کارەکەماندا فەرامۆش ناکەین.
شیعری بارستایی لە درۆی ئایدۆلۆژیا و لە حوجرەی ئیلتیزام هەڵدێ، ئەگەریش بەرپرس بێ، بەرپرسی کاری خۆی و دەروونی خۆیەتی کە شۆڕشگێڕ و وشیارە. کە لە ئیلتیزامیش دەدوێ، لەو ئیلتیزامە نییە کە شانی داوەتە بەر، بەڵکو لە ئیلتیزامێك دەدوێ کە دەیخاتە سەر شان. چونکو شیعری بارستایی بە شوێن بەرپرسیارییەتییەکان و ئیلتیزامە ئاراستەکراوەکاندا ناڕوا، پەیامبەرێتی بە دەروون دەدا تا لە بانگەوازەکانی ئەوەوە ئاراستە وەرگرێ و ئاراستە بکا. کەواتە ئەم شیعرە بەر لەوەی مولتەزیم بێ، مولتەزیم دەکا.
بارستاییگەری (Espacementalism) شێوازی شیعری دیکەی ئێرانە. سیفەتی سەردەمە و ڕووی دەمی لە جیهانە. جا چونکە سیفەتی سەردەمە، نیگارکێشی، تیاتر،

چیرۆك، سینەما و مۆسیقا دەگرێتە خۆی. ئەم مانیفێستەیش بانگهێشتنێکە بۆ ڕێکەوتن. لەگەڵ نیگارکێشان، شانۆنامەنووسان، سینەماگەران و نووسەرانێك کە کاری خۆیان لە ئاست ئەم بانگەوازە دەبینن و دەبینین.
بارستاییگەری شاعیرانێك دەکاتە گرووپ کە بە ئەزموونی کارەکانی خۆیان گەیشتوون، بە چێژی بازدان لە سێ ڕەهەندەوە. کەواتە ئەمەیش بانگەوازەکەمان کە میوەی گەییو دەچنێتەوە!
نە پێشەواین و نە بت، خەبات دەکەین، خەبات دژی ئەوانەی ناپاکی لەگەڵ ئەم دۆزینەوەیەدا دەکەن تا لە خۆفشکردنەوەی فەردی یان کۆمەڵایەتی خۆیان ڕازی بن؛ لە مەلاوە تاکو زانستمەند و هونەرمەند.

# کێلەکان

یەدوڵڵا ڕوئیایی
و: بەڕۆژ ئاکرەیی



پێشەکی

ئەم شیعرانە یارمەتییان دام کە زیندوو بمێنمەوە. تێکڕای ئەو ساڵانەی سەبر سەبر دەهاتنە سەر لاپەڕەکان، زەبرە کاراکانیان ناکار دەکردن، بە زەبرە شەرمنەکانی خۆیانەوە، کە لە سپیایی تێڕاماوی لاپەڕەکان دەدران، مەرگیش بە چەشنێ بوو بە شتێکی ڕۆژانە کە ڕۆژانەکانم لە شیعر بەتاڵ بوون. شاڵاوی مەرگ، بەهای مەرگی هەرزان کردبوو و ژیانیشی چاوەڕێ. کە هەموو دەمرن، چاوەڕوانی درێژتر دەبێ. چاوەڕوانیی درێژیش، پوختەی ئاویلکەیە، کە درێژایی ترسە. یان زەندقچوون لە مەرگە کە درێژایی ئاویلکەیە؟ نەمدەزانی. هێشتایش نازانم. ئێستا تەنێ دەزانم، کە ئەوە مەرگ نییە دێت و دەگاتە سەرمان، بەڵکو ژیانە کە دەڕوا و بە سەر دەچێ. چ دەمرین؟ چ دەزانین. زانینەکانمان، نە بە کاری هەبوونمان دێن، نە بە کەڵکی مردنمان. قسەی من، سەرلەبەر بۆچوونی منن. لە ئاست مەرگدا، ئێمە

تێکرا بۆچوون و گریمانین. تەنانەت ژینی ئێمە، گریمانێکە لە ئەو. تەنانەتی ئەو. هەر ئەویشە کە لە کۆتایی ژیانی مندا ڕاوەستاوە. هەموو شتێك لە مەودای نێوان من و ئەودا ڕادەبووری. نە درێژایی، نە درێژەپێدان، نە ژمارە، هیچ چەمکێك لەم مەودایە، بەدەر نییە. دەرك بە چەمکی هەرسێکیان لەو و لەودا دەکەم، کە ئەم مەودایە خۆی، پڕە لە مەوداگەلێك کە بارستاییە بچووکەکانی خەیاڵ چێ دەکەن.

دەرەوەی شیعر

لە دەقی کێلەکاندا، هۆکاری پێکەوەگرێدان، چەمکێك بە ناوی "مەرگ"ـە، واتا دەقەکان دەزوویەکی ڕێنوێنیکاریان هەیە، کە لە گوورانیاندا پشکێکی هەیە. بەڵام لە «دەرەوەی دەقەکاندا» چەمکگەلێك هاتوون، کە پەیوەندییان بە مەرگەوە نییە. کێلەکانیش پێکهاتەیەکن لەم دووانە: دەقی کێل و دروشمی کێل، کە دەق نییە، بەڵام دەق لەگەڵ خۆیدا دەباتە قوژبنێك. واتا دەق و «دەرەوەی دەق» تێکەڵ کراون. هەبوونی تێکەڵاویی چەمکەکانیش، شیعر بەرەو دەرەوەی شیعر دەبا، لە دەرەوەی شیعریشدا، پشکێك بەر شیعر دەکەوێ، دەخا.

خوێنەر، بەردەوام لە نێوان ئەتمۆسفیر ناوەوەی شیعر و ئەتمۆسفیرێك کە لە دەرەوەی شیعردایە، هاموشۆ دەکا. لە هاموشۆی ئەم دوو ئەتمۆسفیرەیشدایە کە فێری خوێندنەوەی شیعر دەبێت. واتا فۆرمی شیعر، خوێندنەوەیەکی تازەی شیعر بەسەر خوێنەردا دەسەپێنێت. ئەم شیعرانە فۆرمگەلێکیان بە خۆوە گرتووە، کە هەموو فۆرمێك بە لاوە دەنێن.

ئەمڕۆ، بڕێ جار شیعر، هێندە فۆرمی شیعر لا دەدا، کە تێڕامانەکانی مرۆڤ، فامکردنێك لە شتێکی نافامەوە هەڵدەهێنجێنێ. واتا شیعر، دەبێتە تێڕامانێك لە فۆرمی شیعر. ئەمەیش، دەبێتە گەڵاڵەی نوێنووس "نووسین" و خوازەی تازەی نووسین. واتا ئێمە ئەمڕۆ لەگەڵ «کێلەکان»دا دەگەینە شوێنێك، کە شیعر ئیدی فۆرمی شیعر قبووڵ ناکا و بەر لە فۆرمی خۆی دەڕوا. ئەمە، بارهێنانێکی بارستاییە. واتا بردنی شیعر بۆ ئەودیوی شیعر. دەرەوەی شیعر و ناسینی فۆرمە دەرەکییەکانی شیعر. نەك فۆرمی شیعر، بەڵکو

شیعری فۆرم.
کێڵی یەکەم

هەمیشە خەوی من لە داخستنی کتێب
ئێستا کتێبی کراوەی من، لە خەو.



سەرووی کێل، لە لای ڕاست، پلانی گەمییەکی سەرگەردان بکێشرێتەوە، پلانی گەمییەکی بێ چارۆگە. خوارەوەی کێل لە لای چەپ: سەرەتا سەلمان لە کۆتایی خۆی دێتە دەر، لەگەڵ زایەڵەی دەنگی خۆیدا کە لە سەرانسەری گۆڕستاندا دەزرنگێتەوە: ئەی ئەهلی کتێب، خێڵی تێکدەر لە بەڵای نووسیندا! لە ڕازاندنەوەی نێو مەزاریشدا: دەوات، هەنار، خێرایی ڕستە و فرسەخ دەلەرێنەوە. سەلمان لە کۆتایی خۆی دەخزێ و لە بێدەنگیی دەوروبەری گۆڕستانیشدا، دەریا پەیڤێکە لە دەریا.

کێڵی بادیەنشین

لە ساتی مەرگدا
پێڕستی قینم گەر هەبا
دەبووم بە ترێ و
خۆم هەڵدەشێلا!

پلانی سەر کێل، چاوی مارێکی دالەقاو بە مێوێکەوە دابتاشرێ. هەنگاوی باریک، وەکو نەی، کە دووکەڵی دەکرد وەك مەسنەوی. بۆ بادیەنشین، کەخەڵکی جنێو و خەڵکی لۆمە بوو. دایکی پێی دەگوت: تفەنگی قژکاڵ، ئەویش بە دایکی گوتبوو: قسە تێکرا، لەمەڕ قسەیەکەوەن، کە لە گوتنی داماوین.
بە دەوری کێڵدا شوورەیەکی ئاسنین بکێشرێتەوە لەنێو شوورەیشدا: لەتێك دڕکەزی؟ جەمسەرنوێن و کاسەیەکی شکاو دابنرێ.

کێلی شەهاب

مەرگیش، مەسرەفی لەش
لەشیش، مەسرەفی من
بوو

لەسەر کێل، لەشێك هەڵبکۆڵرێ کە دیلی لقوپۆپێکە، کە لە خودی لەشەکەوە دەڕوێن. لەنێومەزارەگەیشدا بۆ شەهاب خۆرەتاوێك لە کاسەسەردا دابنێن، لەگەڵ چەند کۆتەداری نیوەسووتاو و کەمێك ئاسۆی خۆرهەڵات. کە نەدەمرد کاتێك لە حەڵەب بە بکوژەکەی خۆی دەگوت: من نامرم، بەڵکو لەگەڵ مەرگی خۆمدا دەمێنمەوە. لەگەڵ چەند گوڵێکی سوور و خەڵووز.

کێلی یەحیا

تەنیا ئێمەین کە ناگەڕێینەوە
ئێمە،

تەنیا ناگەڕێینەوە

لەسەر کێل: پلانی پێیەکی پێخواس (هەڵکۆڵراو)، باڵێکی ڕەشیش (داتاشراو)ە. بە دەوری کێلیشدا شوورەی ئاسنین هەڵچنراوە، لە نێو شوورەدا قفڵێکی کۆن کەوتۆتە بەر پێ، لە ئەندێشەی یەحیایشدا، شەو جیهان پەڕپووت دەکا.

کێلی حەسەنەك

ڕەش
وەکو کفر لێرە
دڵی کێیە کە بێزارم لە خودا دەستێنێ
دڵی تۆ، قسەیەك،
قسەی دڵی من دەگرێ.

پێنج ئەنگوستی دەست بە شێوەی بورجی نزا دادەتاشرێ، لەگەڵ پلانی باڵێك، کە لە سەرەوە دێتە سەری.
شتەکانی ناو مەزارگە، کە ژوورێکی
پەرپووتە: گەڵای

هەنجیر، چوارچێوەی بێ وێنە و تەسبێحێکی دەنکڕەش دابنرێ لە زیکری حەسەنەکدا، کە دەیگوت: باڵندە لە ئاسماندا  پیتی سەرباره.

کێلی تەواسین

دەست دەشۆم لەم ئیمانە
کۆڵان دەگرم لەم دیوارە
بەرد دەخەم لە چاڵەوە
بۆ نێو چاڵ.
ئاشنا بێگانە
تەسبێح دەژاکێ لە پەنجە
دنك، دێوانە!

لەسەر کێل پێنج ئەنگوستی دەست بە وێنەی بورجی نزا هەڵبکۆلرێ، گەمارۆدراو لە دێڕی: سبح باسم من... سبح باسم انا... و لا اسمی... لە خوارەوەی کێل، لەنێو شوورەیشدا: دۆلکە و گوریس و بایەقوش دابنرێن. بۆ تەواسین، کە تەواسین دەیگوت: جنۆکەی شێتی هەیە، ئەو کەسەی دنك لە زانین هەڵدەگرێ.

کێلی سەعید

لە خەودا دەڕۆم
یان
خەوتوو دەڕۆم
لە خەودا وەك دار
خەوێنەر وەك مار.



لەسەر کێل دابتاشرێ: پێنج ئەنگوست، لە باتی بورجی نزا، مست. پلانی کارێزێکیش، لەگەڵ پەپکەی مارێك لەسەر زارکی هەڵبکۆڵرێ. کەلوپەلەکان: گرێی گوریس و ئاو و دەستگیرەی دەرکەیەکیش لە ژێر کێلدا بۆ ئەڤیندارانی سەعید دابنرێ، کە گوتیان: لە ژێر ئەشکەنجەدا، نیمکەتی مینبەر دەبینی و دەینووسی: ئاسۆ ستوونییە.

کێلی سەبا

لەسەر داری من
لە کەناری من.

لە داربەست کە دەکەوتە خوار
خۆی، دەبوو بە دار و
دادەخرا.

باوەشی ئەوە، کە لێرە
وەرمدەگرێتەوە.

دوو کەس لەسەر سێدارەیەك لە سووچی سەرووی کێل هەڵکەنراون. قەراغی کێل، باوەشێکی کراوەی داتاشراوە، بەرەو گۆڕەکەی تەنیشتی، کە دوو کەسەکەی لە سووچی سەرەوە و لەسەر سێدارە دەخاتە بەرچاو، بە قەراغە بەردینەکەی خۆیەوە کە باوەشێکی کراوەی داتاشراوە. کەلوپەلەکان: چەند ددانێکی شکاو لەسەر هێڵی نۆتەی مۆسیقا، کە لە پیتی سەبادا، پێنج هەڵڕژا کاتێ بە هێڵی نۆتەی گوت: بەر لەوەی بمرم، بۆ تۆ دەمردم. ئێستا ئیدی ناتوانم.

کێلی دارا

گەڵایەك لە لقێکی ڕووتەوە
کەوتە سەر ئێجگارەکان و
ناوی خۆی ون کرد.

لەسەر هێڵی بێکەناری گۆڕستان،

گۆڕەکەی بەتاڵ لە هێڵ دابنێن. چونکە دارا لەسەر کێلی خۆی، دەبێتە خاوەنی مەرگی خۆی. بە دەوری کێلدا: شوورەی ئاسنینی ڕەش و لەنێو شوورەیشدا: وێنە، بارووت و دەنگهەڵبڕین و پێکەنینی دارا دابنرێ، کە گوتی: ژمارەکان شێوەکەی تری سیفرن.

کێلی سادق

بڕوانە لێم زیارەتگەر!
تاوێکی خۆش لێم بڕوانە
تاکو بۆت ببمە جێگەی سەرنج.

کێل بە شێوەیەك دابتاشرێ کە ئەگەر لێی وردبییەوە، ڕووخسارێك دەبینیت.
لە ژووری ئارامگەدا: چاویلکەیەکی کۆنی درزبردوو، چاوی قەلەباچکە و سێبەری سادق، کە لە نیگای ئەودا، شتێکی لە چاوەڕوانی دەبینی، کاتێك کە گوتی: چاوەڕوانی، لە تۆدا، چاوبازییە.



کێلی فروغ

کۆتریکی لە گاسن بەستراو، لەسەر کێل دابتاشرێ و لە خوارەوەی کێلیش مەودایەك دابنێن بۆ: خۆڵی سەر باڵ، نیرە و دەنگی فروغ کە گوتی: خێرایی هەڵگرن و لە کۆتایی ڕستەی دابنێن.

بە هەنگاوی تۆ دوور دەکەومەوە لە خاك
قومێك خاك!
کێڵانیش،
دڵتەنگی ئاسۆ دەبێ.

کێلی خواجه فاراب

پلانی سەر کێل: بایەك دابتاشرێ کە ئەسپینداریك دەشکێنێ، گۆڕستانیش تەنیایە. چاندنی ئەسپینداریك لەسەر گۆڕ، خواجەفاراب لە خوارەوە، زیارەتگەرەکەی خۆی، دیکەیەکی خۆی دەبینێ: من لێرەم و لە کوێیەکانم. لە شوورەی مەزارگەدا، دەرکەیەکی شکاو لەنێو لمدا دابنرێ.

خۆم نەمدەزانی
کە مردووم.

بە گۆڕمدا کە ڕادەبووری
مەرگی ئەرخەیان
مەرگی ئەرخەیان دەیپرسی:
کەی با لێرەوە
بە تەنیا ڕادەبووری؟

کێلی عەباس

پێنج ئەنگوستی دەستی ڕاست بە وێنەی بورجی نزا لە سووچی سەرووی کێل دابتاشن. لە خوارەوەی گۆڕیش داربییەك بڕوێنن و لەنێو مەزارگەیشدا بۆ ڕازاندنەوە: چەند کەستەك، شکۆفەی خورما، چەند تیر گەزۆ "سەرەتیر" دابنرێن کە عەباس لە نێوان دوو برۆدا، تێپەڕین دەناسێتەوە، کاتێك بەسەر ئاودا گوراندی: کە خاك، ئەگەر خاکی بێ، با بەسەر مندا بێ!

ڕۆژێ کە مەرگی دیکەم دێ
تۆ لەگەڵ منەکەی دیکەتدا وەرە
تا لەسەر خەیاڵم کاتێك
دادەنیشێ خشت
دابنیشێنێ لەسەر خۆی خەیاڵی تۆ.

کێلی نیسان

پلانی تەورێك لە سووچی خوارەوەی کێل هەڵبکۆڵرێ، بە دارسنجوویەکەوە لە بیاباندا. لە نێوان نیشانە و ئاماژەکانیشدا، دەرگایەکی کراوە، گرێیەك، پلیکانێکیش کە لێیەوە نیسان لە یادگەی خۆی دەردەکەوێ و لەسەر

چاڵ، هەوڵ دەدا واتایەك بۆ ئاڵوگۆر دابنێ، دەچڕێ: ئیدی بەرەو بێئەنوایی خاك، ناگەڕێمەوە.

لەگەڵ دوا جەستەدا
مردووشۆر، دوا جەستە بوو
دانیشە تا ئەوەی لە نادیارمان دەزانی
لە نێوان من و تۆدا دانیشێ نادیار.




کێلی سارا

خەونی ڕژاو
دۆڵی جوان
مەرگ.

هەر کە باڵی کەلاکخۆر و سێبەری قورئانخوێن
بسکی دۆڵ
لە هەڵڕژاوەکانی خەیاڵە چنراوەکانی فریوی قژاك
تاریك دەکەن
پەنجەی دۆشاومژەم ئەی زیارەتگەر
بکە بە لەنگەری نێوان بسکەکانت
تا شوێنی مەرگ بناسییەوە.

لە پلانی سەر کێل، چەند پەنجە لە پەلاپیتکەوە دەرژێن. شوورەی ئاسنین لە گەمارۆی گۆڕدا. لەنێو شوورەدا: نیمکەتێکی شکاو، دەرکەیەکی نیوەتاك. لەسەر سەری سارایش، درۆ دەخولێتەوە. لە خوار سەریشیەوە زایەڵەی ئەم دووپاتبوونەوەیە: بڕۆ سارا، بڵێ سارا!
ئەشکەنجە ئاوەز دەکاتە فڵتە.

کێلی بولعەلا

میلێکی خواروخێچ، نەك شکاو، نەخشی بەرجەستەی سەر کێلە. دارخورمایەك و دارفستقێکیان لە پاڵ گۆڕەکە چاندبوو، لە ژوورۆچکەی سەر گۆڕەکەیشدا، چەند هیجایەکی گیایی و چەند بڵۆق و پەلی گوێی بولعەلا دەخەنە نێو سندووقێکەوە. چونکە پەلی گوێ بۆ ئەبولعەلا، قسەیەکی سەربەمۆر بوو، زمانی ئەویش دەستپێکی دووبارەی ئەو بوو.

وادە کە لەگەڵ مندایە
وادەیش ئەوە
تۆیش چمای منیت
هەستانی شتێك لە ئێمەدا
هەڵچوونی وادە و چما.

بولعەلایش لە ساڵی سێسەد و حەفتا و پێنجدا، کاتێك لە هەڵمەتی ئاوڵەدا کوێر دەبوو، لە سوهرەوەرد بۆ یەحیای نووسی: زمانی تۆ، تێکڕای تۆ نییە.

کێلی شەمس

لەسەر کێل: پلانی پەلی گوێیەك و ئاسنەڕێ، لەسەر دیواری مەزارگەیش، دوو پەڕی مەزن، شاپەڕ، لەگەڵ کراسی جاوی شەمسدا هەڵبواسرێن. چونکە هەموو بەیانییەك کە لە خەو هەڵدەستا، دەیپرسی: کێیە کە پرسیار لە خەو هەڵدەستێنێ.

کەواتە مەرگ
شتێکی دیکە بوو!

کێلی ئەحمد

لەسەر کێل، پێنج ئەنگوست بە وێنەی بورجی نزا. لەسەر گۆڕ، کە لە درزەکانیانەوە چەند قەڵەمڕەساسێك سەریان دەرکێشاوە. لە سووچی خوارەوە، پاژی کاسەسەرێك، کە چاوەکانی بە چەند پەڕێکی سپی پڕ کراونەتەوە. لەسەرەوەیش، بە ئەحمەد، زیارەتگەرەکەی دەڵێ:

ـ  ئێستا چاکترت دەخوێنمەوە.
ـ سنوورە نزیکەکانیش دەبنە قوربانیی دوورە بێسنوورەکان. بیر دەکاتەوە، ئەحمەد لە ژێر خاکدا.

لەگەڵمدا دانیشە
کەلـلەسەر لەسەر سەرین میهرەبانترن،
لە ژێر تەپۆڵکێك خەودا
تەنیا، لەگەڵ تەپۆڵکی خەودا.



کێلی حافز

چ ژێرێکی ڕەقی هەیە خاك!

دەنگی ئەو لەسەر کێل بە چەشنێ دابتاشرێ، کە دەڵێیت چەند پەیڤێك خەریکن بە مردوویی لە دایك دەبن. کەلوپەلی نێو مەزارگەیش: مۆم، کولیچە، دیوانێکی دەستنووسی حافز، تەراز و شاقۆڵ دانراون. لە خوارەوەی کێلیش: دەستێك، بێدەنگی لەنێو کتێبێك دەردێنێ، خواجەیش پەیڤگەلێك دەخوێنێتەوە، کە لە ڕستە بەربوونەتەوە:

ژێر
چ
ڕەقێکی
هەیە
خاك

کێلی جەلال

لە گڵکۆی مندا
باڵا دەکا پەشیمانی










قورسایی بۆچی لەسەردا

جەلالیش بە کۆرپەکەی خۆی گوت: من لە بەرزایی، شەوم داوا کرد نەیدامێ. تۆ لە داکەوتنت لە قسە، شتێك بخوازە. بەکرەی بێ دەزوو، کاگڵ، هەرمەڵە و دڕکوداڵ، لەسەرەوە. لە سووچی خوارەوەی کێڵیش دابتاشرێ: پێیەك، کە شەقێك لە کلیل هەڵدەدا.
کێڵی تەلایە
چەند ملێك کە پشتیان لە دیوار کردووە و دیواریش کە بۆتە ئاسمان. نەخشی بەرجەستە لەسەر سەنگ دادەتاشرێ. چەند فیشەکێك لە سووچێکی مەزارگەدا دادەنرێن، لەگەڵ کەللەسەرێکدا بە زەردەخەنەوە، چونکە تەلایە لە تیربارانەدا عەدەمی هەتاویی دەبینێ.

داوێنم، لە خاك
کە دەرکێشا
بەژنی تیشك
داچەمی
حیلەیش لە پەنا دیوار

# زافۆن و گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکان

## ڕانان و وەرگێڕانی لە ئینگلیزی و سویدیەوە: سورمە

من ئێستا کە دەمەوێت باسی ناسینی زافۆن بۆ ئێوە بکەم، دەبێت لەگەڵ مندا هەنگاو بەهەنگاو بچنەوە دواوە تا دەگەڕێنەوە ئەو بەرەبەیانەی لە شارێکی دورەدەست و بچکۆلەدا لە ئوتێلێکی هەزار ئەستێرەیی رەنگیندا ئەڤینداربووم.
وەك رۆژەکانی پێشوی ئەو حەفتەیە دەنگی دەرگا هات و خانمێکی گەنمرەنگ بە سینییەك بەرچایی ئەو بەیانەوە بە نەرمە رۆیشتنێکەوە خۆی کرد بە ژوورەکەماندا. من لەگەڵ خواردنەوەی قاوەکەمدا رۆژنامەکەم هەڵگرتوو چاوێکم بە پەرە بۆرەکانیدا گێرا، جارجار ئاورێکم بۆ ئەدایەوە و سەیرم دەکرد کە لە تەنیشتمەوە نیوە ڕووت خەوتبوو. لە پەرەی ژمارە 7ی رۆژنامەکەدا ریکلامێکی بچکۆلەم بینی بۆ کتێبێکی نوێ کە هەر ئەو ڕۆژە لە کتێبفرۆشییە خنجیلانەکەی ئەوشارەدا کڕیم.
دەمم پڕ کرد لە قومێك قاوە و بە سەری پەنجەم خەبەرم کردەوە، چاوە خورماییەکانی کردنەوە و کە

منی بینی نەرمە خەندەیەك کەوتە سەر لێوەکانی، ماچم کردوو قاوەی ڕەش چووە ناو دەمی. وتی گەر هەموو بەیانییەك تۆ قاوە بکەیت بە دەممەوە من هەرگیز پیر نابم.
پێم وت کە لە ڕۆژنامەی ئەمرۆدا کتێبێك هەیە و باسی کوڕێك دەکات بە ناوی دانیاڵ کە باوکی سپێدەیەکی زوو دەیبات بۆ شوێنێکی نهێنی بە ناوی "گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکان" و لەوێ دەبێت کتێبێك هەڵبژێرێت وئیدی بە درێژای ژیانی لە ونبوون و لەناوچوون بیپارێزێت.
وتم ئەم کتێبە سەرنجراکێشە، من دوشێکی خێرا دەکەم و دەچم دەیکڕم، بەڵام ئەو دەستەکانی گرتم و بۆ ناو باوەشی پەلکێشی کردم. دوای چەند سەعاتێك کە خەبەرم بۆوە نیوەڕۆ بوو کتێبەکە و نامەیەکی بچکۆلە لە تەنیشت سەرینەکەمەوە دانرابوو. لە جێگاکەم بەرزبوومەوە و چەند جارێك خۆم کێشایەوە و گوێم لە ئێسکەکانی خۆم گرت.
من پەنجا پەرەی کتێبەکەم خوێندبووە، بەڵام تا لێوی نەخستە سەر شانم هەستم بەوە نەکردبوو گەڕاوەتەوە و لە ژوورەکەدایە. هیچ پرسیارێکی نەکرد و وتی دوای باسی دانیاڵم بۆ بکە.
من ئەو کاتەی زافۆنم ناسی لە جوانترین و گەرمترین ڕۆژەکانی عەشقدا دەژیام، ئێستا لەم شارە گەورەیەدا کە چەندین ملیۆن خەڵکی تیادا دەژی و من هێشتا بیر لەو ڕۆژە گەرم و جاویدانانە دەکەمەوە کە بە سەردەمی زێڕینی خۆمی دەزانم دەمەوێت بڵێم من زافۆنم ئاوا ناسی و ئاوا عاشقی بووم، دیارە ئەو زەمەنەی مرۆڤ کتێبێکی تیادا دەناسێت گرنگی و کاریگەری خۆی هەیە، دۆخی مرۆڤ تەواو خوێندنەوەکان دەگۆڕێت، چاوی ئەڤینداران چاوێکی ترە، وەك چۆن چاوی ڕەخنەگرانیش چاوێکی ترە.
بەرای من زافۆن و کتێبەکانی لەو جۆرە نووسینانەن دەبێت بدۆزرێنەوە، پێشنیارکردنی بۆ هەرکەسێك هێندەی ئەوە سیحری نابێت کە خۆت لە بەرەبەیانێکدا ئەو کاتەی قاوەی گەرم بە گەرووتدا دەچێتە خوارەوە دەیناسیت و دەزانیت کتێبێك هەیە و باسی شوێنێکی لەیادکراو دەکات، چ خوێنەرێك کونجکۆڵنابێت لە دۆزینەوەی ئەو شوێنە؟ من زافۆنم دۆزییەوە و یەك بەیەك ڕۆمانەکانیم خوێندنەوە و بە تاسەوە چاوەڕوانی



چاپکراوی نوێیم دەکرد.
گرنگی نوسینەکانی زافۆن لەوەدایە ناهێڵێت خوێنەر تەنیا ساتێکیش ئارام دابنیشێت و ئارام هەناسە بدات، هەمیشە دەبێت چاوەڕێی دۆزینەوە و کەشفکردنی نهێنییەك بیت. هەر لەیەکەم پەڕەی کتێبەکەوە دەتباتە گرنگترین شوێنی ناو رۆمانەکەی کە پێی دەوترێت "گۆڕستانی کتێبە لە یادکراوەکان".
خاڵێکی تری نووسینی زافۆن ئەوەیە هەرگیز هەست ناکەیت لە شوێنێکی نووسینەکانیدا زیادی وتووە و لە شوێنێکیتردا کەم، هەمیشە ئەو هەستەت دەداتێ کە لەبەردەم نووسەرێکی گەورە و رۆمانگەلێکی گەورەدا تۆ وەك خوێنەر خەریکی کەشفکردنی کۆدەکانیت. لەگەڵ خوێندنەوەی هەر چاپتەرێکدا هەستدەکەیت رێگای دوور و جەنگەڵی تاریك و دارستانی چڕت بڕیوە، لە چەندین تارمایی رەش و تۆقێنەر رزگارت بووە، خوێنەر بە جۆرێك بە رووداوەکانییەوە گرێدەدات خۆت وەك بەشێك لە نووسینەکانی سەیردەکەیت و دەتەوێت پارێزگاری لە خۆت بکەیت. دڵت پڕدەبێت و دەگریت، دەترسیت و گوێت لە دەنگی دەرگا و پەنجەرەی کراوە دەبێت، مرۆڤگەلی ترسناك بە دواتدا دەگەڕێن و نامەت بۆ دەنێرن و لە شتی سەیر و نهێنی ئاگادار دەکرێیتەوە. بە رای من زافۆن خۆی نهێننیە گەورەکەیە و من بەردەوام بە شوێنیدا دەگەڕێم. ماوەی چەندساڵێکە لەگەڵ پێشکەوتنی بەرچاوی تەکنەلۆژیا و ئەو ئاسانکارییە جۆربەجۆرانەی بۆ خوێنەر کراوە و هەروەها لە ڕێگای هەموو ئەو پلاتفۆرمانەی بۆ خوێندنەوە بەکاردێن، باس لە لەناوچونی وشەی چاپکراو دەکرێت، هەزاران دێبەیتی جیاواز کراوە وە چەندین نووسەر لە رێگای رۆمانەکانیانەوە هەوڵیانداوە تەکنلۆژیا وەك مەترسییەکی گەورە ناوزەدبکەن بۆ کتێب، لێرەدا پێویستە ناوی پاول دیسالمەند بێنین کە لەو بارەیەوە رۆمانی "ژیانی من وەك کتێب"ی نووسیوە هەروەها لاورێنس کۆسی بە کتێبی "کتێبفرۆشی خەون". بەڵام بە رای رەخنەگران "سێبەری با"ی زافۆن باشترین کتێبە کە باس لە لەناوچون و ئەو مەترسیانە دەکات کە لەسەر کتێب و خەیاڵ و خەونەکانی مرۆڤەکانی سەدەی نوێ دروستی کردووە.
عەشق و ڕق و تۆڵەسەندنەوە بەشێکی گرنگی تێمای نووسینەکانی زافۆن پێکدەهێنن، لە راستیدا زافۆن دەمانخاتە بەردەم ئینسان و هەموو دیوەکانی. جولیان نمونەی ئەو مرۆڤانەیە کە عەشق لە نووسەرەوە دەگۆڕێت بۆ جەلاد. دانیال نمونەی ئەو گەنجە خوێنەرانەیە کە بەدوای



کتێب و نهێنییەکانیەوەن، سێمپرێ نمونەی ئەو باوکانەیە کە ژیانیان بۆ منداڵ و یادەوەرییەکانیان تەرخانکردووە.
زافۆن باسی شتێکیترمان بۆ ناکات جگە لە مرۆڤ خۆی، ئەوەی دەیگێڕێتەوە چیرۆکی مرۆڤەکانە.

کارلۆس رویز زافۆن لە ساڵی 1964 لە بەرشەلۆنە لەدایك بووە، لە سەرەتادا وەك کەسێکی سەربەخۆ بۆ هەندێك کۆمپانیای جیاوازی ڕیکلام کاری کردووە، پاشان لەم کارە ماندوو دەبێت و هەموو کاتەکانی خۆی بۆ نووسین و مۆسیقا تەرخان دەکات.

یەکەم کتێبی زافۆن بە ناوی "شازادەی تەم"ە کە لە ئەدەبی ئێستادا بە رۆمانی مێردمنداڵان دەناسێنرێت و هەر ئەو کاتە خەڵاتی ئەدەبی منداڵانی پێدەدرێت.
لە دوای ئەوەی لە ساڵی 1993 دا بەرەوە لۆس ئەنجولس دەروات و دەست دەکات بە کاری سیناریۆ نووسین بۆ هۆلیود. هاوکات خەریکی نووسینی ڕۆمانی "سێبەری با" دەبێت کە لە ساڵی 2001 لە ئیسپانیا چاپ و بڵاودەبێتەوە.
(سێبەری با) لە ٤٠ وڵاتی جیاواز فرۆشراوە و بۆ چەندین زمان وەرگێردراوە
رۆمانی سێبەری با لە دوای رۆمانی دۆنکیشۆتەوە پڕفرۆشترین رۆمانی ئیسپانییە.
لێرەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە ئەم رۆمانە یەکەم رۆمانی ئەو زنجیرە کتێبەیە کە بە ناوی "گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکان"ە.

دووەم کتێبی ئەم زنجیرەیە بە ناوی "گەمەی فریشتەکە"یە و لەساڵی 2008 چاپکراوە. لە ساڵی 2011 شدا سێیەم رۆمانی ئەم زنجیرە کتێبە بە ناوی "زیندانی ئاسمان" چاپ و بڵاودەبێتەوە.



ناوی رۆمانەکانی زافۆن کە دەخرێنە کاتیگۆری ئەدەبی مێردمنداڵەنەوە:

کتێبی شازادەی تەم سالی **1993**
کتێبی کۆشکی نیوەشەو **1994**
کتێبی بینەرەکانی ناو تارمایی **1995**
کتێبی ماریانا **1999**

## دیمانەیەك لەگەڵ کارلۆس رویز زافۆن

سازدانی: گیلبەرت کروز
و. لە ئینگلیزییەوە: سورمە

گیلبەرت: هەردوو ڕۆمانی سێبەری با و گەمەی فریشتەکە بە دەوری ئەو شوێنە تاریك و ئەفسوناویەدا دەسوڕێنەوە کە ناوی گۆڕستانی کتێبە لەیادکراوەکانە. دەتوانیت وردەکارییەکەیمان بۆ باس بکەیت لەگەڵ ئەوەی کەی ئایدیای تەمومژاوی ئەو شوێنە کەوتە سەرتانەوە؟

زافۆن: گۆڕستانی کتێبە لە یادکراوەکان گەورەترین و نایابترینْ کتێبخانەیە کە تۆ بتوانیت لە خەیاڵی خۆتدا وێنای بکەیت.
لابۆرێکە لە کتێب کە تونێل و پرد و شوێنی نهێنی تێدایە - شاراوەیە لە ناو شوێنێکی کۆندا لە شاری بەرشەلۆنەی دێریندا. شوێنێکی نهێنییە کە خەڵکانێکی کەم پێیدەزانن، وە لەویادا دەتوانیت هەموو ئەو کتێبانە بدۆزیتەوە کە بزربوون، لەیادکراون و ئینسان هەوڵیداوە لەناویانبەرێت.
ئەم جێگایە لەلایەن گروپێکی نهێنی لە مرۆڤەوە سەرپەرشتی دەکرێت و بەڕێوە دەچێت کە هەوڵدەدەن پارێزگاری لە کتێب و یادەوەری و ئایدیاکان بکەن.
ئەم شوێنە چەندین سەدەیە هەبووە و شتەکە بەم جۆرەیە، یەکەم جار کە ئاشنای ئەم شوێنە



دەکرێیت، تۆ مافی ئەوەت دەبێت کتێبێك هەڵبژێریت لەناو هەزاران کتێبی تر لەم کتێبخانە گەورەیەدا، وە تۆ دەبێت ئاگاداری بیت کە هەرگیز ون نەبێت و لەناونەبرێت.
بیرۆکەی ئەم کتێبەم لە کۆتای ساڵەکانی 1990دا لەلا گەڵاڵە بوو، پێموایە لەوەوە دروست بوو کە لەو کاتەدا هۆشیاریم بەرامبەر ئەوە درووست بوو کە لە ناوبردنی یادەوەریی لە ناوبردنی مێژووە.
من هەمیشە پێم وابووە ئێمە ئەوەین کە بیرماندەکەوێتەوە و لەیادمان دەمێنێتەوە. وە تا کەمتر بیرمان بکەوێتەوە و ئێمە کەمتر دەبین.
بە بیکردنەوە لەوە و گەڕان بە ناو وڵاتدا و دۆزینەوەی هەموو ئەو کتێبفرۆشییە نایابانە کە هیچ کەسێك سەرنجی نەدەدانێ، هەموو ئەم شتانە لە مێشکمدا دەسورانەوە، لەو کاتەدا وێنەی ئەم شوێنە هاتە بەرچاوم. ئەوە ڕوونە کە ئەو شوێنە وێنەیەکی سیمبۆلی بوو بۆ نەك تەنیا ئەو کتێبانەی بیرچونەتەوە بەڵکو خەڵکان و ئایدیاگەلێکیش کە فەرامۆشکراون.

گیلبەرت: ئەم کتێبانە سەرەتا و ناوەراستی سەدەی بیستەمی بەرشەلۆنە باس دەکەن، چ شتێك لەو زەمەنەدا هەیە کە سەرنجی تۆی راکێشاوە تا هێندە کونجکۆڵ بیت بەرامبەریان؟

زافۆن: من سەرسامم بەو زەمەنەی لە شۆڕشی پیشەسازیەوە دەستپێدەکات تا دوای جەنگی جیهانی دووەم. شتێك لەو ساتەی زەمەندا هەیە کە ئازایانە و تراژیدیانەیە. خاڵێك هەیە لە دوای شۆڕشی پیشەسازی کە وا دەردەکەوێت دواجار ئینسان شتەکان بە "ڕاست"ـی بکات. بەرەوپێشچوون لە دەرمانسازی و تەکنەلۆژیا و سیستەمی پەروەردەدا روویاندەدا. مرۆڤ دەیتوانی تەمەنی درێژ بێت و زیاتر بژی. خوێندەواری زیاتر بڵاودەبۆوە. هەروەك ئەوەبوو دواجار دوای چەندین سەدە لە کاری قورس و رەنج و بەدبەختی مرۆڤ بەرەو دۆخێکی باشتر بڕوات. وە ئەوەش کە دوای ئەوە روویدا ڕێك پێچەوانەکەی بوو. مرۆڤایەتی خیانەتی لە خۆی کرد.



گیلبەرت: کارەکتەرەکانی تۆ هۆگری کتێبن، ئەمە بەشێکی بەهۆی "گۆرستانی کتێبە لەیادکراوەکان"ە و ئەوەیتریشی بەهۆی شوێنی دوهەمی ناو ڕۆمانەکەت کە کتێبفرۆشییەکەیە. تۆ هەمیشە دەوری خۆت بە کتێبەکان تەنیوە؟

زافۆن: منداڵی من کتێب و نووسین دەوریان دابوو. لە تەمەنێکی زۆر بچکۆلەوە من سەرسام بووم بە چیرۆك گێرانەوە، بە ووشەی چاپکراو، بە زمان بە خەیاڵ. من بەدوایاندا دەگەرام. هەڵبەت من کتێبفرۆشییەکی جوان وەك ئەوەی لە کتێبەکەمدا باسی دەکەم لەبەردەستمدا نەبوو. بەڵام بە زۆر شێوەی جۆراوجۆر من هەمیشە ئەوەی دەمکرد دروستکردنی چیرۆك و کارەکتەرەکان بوو. تەنانەت پێش ئەوەی فێری خوێندنەوە و نووسین ببم، من چیرۆکم دەگێرایەوە. من هەمیشە ئەوەم زانیوە کە دەبمە نووسەر چونکە هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەم لەبەردەستدا نەبوو. من بەردەوام بەو ڕاستییە سەرسام بوو کە دەتوانی کاغەز و مرەکەب بەکاربێنیت بۆ دروستکردنی ووشە، وێنە، کارەکتەر. ئەمە وەك ئەفسون دەردەکەوت.




گیلبەرت: تۆ باسی ئەوە دەکەیت کە کتێب و مرەکەب و کاغەز ئەفوسنیان لێتکردووە، پێدەچێت تۆ نرخ و قورساییەکی زۆرت لە سەر وشە چاپکراوەکان دانابێت، واتە بەرهەمەکە خۆی. ئایا تۆ بیرت لەوە کردۆتەوە کە ئەمە چەند گۆرانی بەسەردا دێت لەگەڵ ئەوەی پێی دەوترێت کتێبی ئەلکترۆنی؟

زافۆن: ئەمە هەمووی دەربارەی بەشداریکردنە، پێم وانییە ئەمە هیچ پەیوەندیەکی بە کتێب و ئەدەب و گێرانەوەوە هەبێت. مێژووی چاپکردن ئەم پێشکەوتنانەی بەردەوام بە خۆیەوە بینیوە، گەر بگەڕێیینەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم ئەو کاتەی هەندێك لە باشترین ئەو ڕۆمانانەی دنیای تیادا نووسران کە سەردەمەکانیتریش دەژین، چاپکردن زۆر جیاواز بووە. خەڵك کەمتر کتێبی کڕیوە، ئەوان چیرۆکەکانیان بەش بەش خوێندۆتەوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا. هەندێك لەم چیرۆکانە دواتر کۆکراونەتەوە و چاپکراون. بەڵام بە گشتی هەموو کلتوری کتێب فرۆشتن و چاپکردن زۆر جیاواز بووە. ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ دەیناسین ئەو بەرهەمەیە کە لە سەدەی بیستدایە. ئایا لە داهاتوودا بەرەو کوێ دەڕوات من نازانم. بەڵام من دەزانم سروشتی ئەو جۆرە لە گێرانەوە لە ناو زمان و ئەدەبدا هەرگیز ون نابێت چونکە ئەوە بەشێکە لە سروشتی مرۆڤ.

گیلبەرت: ئایا ئەم قسەوباسانە لە ئیسپانیا و ئەوروپاش دەکرێن؟ ئایا ئەمە وەك کێشەیەك سەیر دەکرێت لەوێ؟

زافۆن: پێم وانییە ئەمە لە ئەوروپا وەك کێشیەکی گەورە سەیربکرێت، دیارە خەڵك دەربارەیان قسە دەکات بەڵام من نیگەرانییەکی زیاتر دەبینم لەلای چاپ و بڵاوکراوە ئەمریکیەکان. من پێم وایە بەشێکی زۆرلەمە پەیوەندی بەو جۆرە مامەڵەیەوە هەیە کە میدیا و راگەیاندنەکان لەگەڵ ئەدەبدا دەیکەن. لە ئەمریکا ئەوە زۆر زەحمەتە کە لە راگەیاندنە هەمەجۆرەکانتدا کورتەیەك دەربارەی کتێبێك جێبکرێتەوە، شوێنی زۆر کەمە بۆ ئەمە، زۆر لە رۆژنامە هەواڵییەکان خۆیان پەستاندۆتە شوێنی ئەمانە. بەڵام گەر برۆیت بۆ ئەوروپا ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کە زۆربەی ڕۆژنامە هەواڵییەکان و تەلەفزیۆن و رادیۆکان بەبەردەوامی خەریکی ناساندنی نووسەر و بەرهەمەکانیانن. ئەمە بەشێکە لە ژیانی خەڵکی. لێرە پێدەچێت تەنیا خوێنەرە جددیەکان نیگەرانی ئەم شتانە بن. پێناچێت کتێب و ئەدەب بەشێك بێت لە بزاوتی سەرەکی کە ئەمە بۆ خۆی شەرمە.







سەرچاوەکان:

http://www.aftonbladet.se/wendela/ledig/article11721206.ab

http://www.time.com/time/arts/article/0,8599,1907807,00.html#ixzz2PnqmWOjg




بەشێک لە ڕۆمانی

# سێبەری با

کارلۆس ڕویز زافۆن
و. لە سویدییەوە: هیوا قادر

گەنجینەی کتێبە لە بیرکراوەکان

تائێستاش ئەو بەرەبەیانەم لەبیرە کە باوکم بۆ یەکەم جار لەگەڵ خۆی بردمی بۆ گەنجینەی کتێبە لەبیرکراوەکان، یەکێك بوو لە بەرەبەیانە پرشنگدارەکانی هاوینی ساڵی ١٩٤٥، هەردووکمان بەسەر شەقامەکانی بەرشلۆنەدا کە لەناو هەورێکی خۆڵەمێشیدا پاڵیدابووەوە ئەڕۆیشتین، خۆرێکی پەردەپۆشکراویش وەك مسێکی تواوە بەسەر رامبلا دێ سانتا مۆنیکادا ئەڕژا.
باوکم وتی:
ـ دانییێل، ئەوەی ئەمڕۆ ئەیبینیت نابێت بۆ هیچ کەسی باس بکەیت. تەنانەت بۆ تۆماسی هاوڕێشت، بۆ هیچ کەسێك.
منیش وەك ئەوەی بچرپێنم وتم: تەنانەت بۆ دایکیشم؟
باوکم ئاهێکی هەڵکێشا و زەردەی ئەو خەمە لەسەر لێوی نیشت کە بەدرێژایی عومری هەمیشە وەك سێبەرێك بەدوایەوە بوو. بەسەری نەوییەوە وەڵامی دامەوە.
ـ ئاهـ بێگومان. ئێمە هیچ نهێنییەکمان لەگەڵ ئەودا نییە. هەرچییەکت هەیە ئەتوانیت بۆ ئەوی باس بکەیت.
هەر دوای ئەوەی شەڕی ناوخۆ کۆتایی هات پەتای کۆلێرا بڵاوبووەوە و دایکمانی لەگەڵ خۆی برد. هەمان ئەو ڕۆژەی کە من بووم بە چوار ساڵ دایکم لە سەرقەبرانی مۆنتۆیك نێژرا. لەبیرمە بەردەوام بەدرێژایی ڕۆژەکە و شەوەکەشی باران ئەباری، کاتێکیش لە باوکم پرسی ئەوە ئاسمانە ئەگری بە وشەیەك چییە نەیتوانی وەڵامم بداتەوە. دوای تێپەڕبوونی شەش ساڵیش بەسەر مردنەکەی دایکمدا هێشتا ئەو بۆ من وەك سەرابێك، وەك قیژەیەکی بێدەنگ وەهایە و تا ئێستاش نەمتوانیوە فێری ئەوەببم بیکەم بە وشە. من و باوکم لە شوقەیەکی بچووك لە کالێ سانتانا نزیك سەرقەبرانەکە ئەژیاین. شوقەکەمان ڕێك لەسەر دوکانی کتێبی ئەنتیکفرۆشییەکە بوو، ئەوێ بۆ من ئەو جیهانە سیحرییە بوو کە باپیرم دایمەزراندبوو، باوکیشم بەدڵ تەمەنای ئەکرد ڕۆژێك بێت من ئەو شوێنە بەرم بەڕێوە. من لەناو کتێبەکاندا گەورەبووم و چەندان هاوڕێی نەبینراوم لەناو ئەو پەڕانەدا پەیداکرد کە بەدەست لێدانیان ئەپروان، هەتا ئەمڕۆش بۆنی ئەو پەڕانە بە دەستەکانمەوە ماون. ئێواران ڕاهاتبووم ئەچوومە ژوورەکەی خۆم و بەتاریکی باسی هەموو ئەو شتانەم بۆ دایکم



ئەگێڕایەوە کە لەو ڕۆژەدا ڕوویاندابوو، چی لە قوتابخانە گوزەرابوو، باسی هەموو ئەو شتە تازانەم بۆ ئەکرد کە فێریان بووبووم... من نەم ئەتوانی گوێم لە دەنگی دایکم بێت یان بۆنی پێستی بکەم، بەڵام گەرمی و ڕووناکی ئەو بەسەر هەموو شتێکی ناو ماڵەکەدا ئەلەنگایەوە، لەگەڵ ئەو تەمەنایەی هەمبوو گەرچی هێشتا تەمەنیشم ئەوەندە نەبوو ئەمتوانی ساڵەکانی عومری خۆم بە پەنجەکانم بژمێرم، باوەڕم وابوو گەربێتو چاوەکانم بنوقێنم و قسە بۆ دایکم بکەم ئەو ساتانە دایکم لە هەر کوێیەك بێت ئەتوانێت گوێی لە دەنگم بێت. هەندێك جاریش باوکم لە ژووری نانخواردنەکەوە گوێی لێم ئەبوو کە چی ئەڵێم بۆیە ئەویش بەبێدەنگی دائەنیشت و ئەگریا.




من ئەو بەرەبەیانەی مانگی یونیم لەبیرە کە بەدەم قیژەی خۆمەوە ڕاچڵەکیم، دڵم بەچەشنێك خۆی ئەکێشا بە سنگمدا وەك ئەوەی ڕۆحم بیەوێت لە جەستەم بێتە دەرەوە و هەڵبێت. باوکم بە ترس و ڕاکردنەوە هاتە ژوورەکەم و بۆ ماوەیەکی زۆر خستمییە ناو باوەشە ئارامەکەی خۆیەوە. بەدەم هەنسك هەڵکێشانەوە ئەمووت:

ـ من ناتوانم دەموچاوی ببینم. من چیتر ناتوانم دەموچاوی دایکمم بیربکەوێتەوە.

باوکم توند باوەشی پیاکردم.

ـ خەمبار مەبە، دانییێل، من لەبری تۆش لەبیرمە.

لەو نیوە تاریکییەی ژوورەکەدا سەیری یەکتریمان ئەکرد و بەدوای وشەیەکدا ئەگەڕاین کە نەبوو. بۆ یەکەم جار بوو ببینم باوکم خەریکە پیرئەبێت، چاوەکانی کە هەمیشە مات و پڕ لە غەریبی بوون لەو کاتەدا نیگایان ڕووە و دوا بوو. باوکم هەستایە سەرپێ و پەردەکەی لادا بۆئەوەی تیشکی ڕوونی ئەو بەرەبەیانە بێتە ژوورەوە.

ـ خۆت لەبەرکە، دانییێل. شتێك هەیە ئەمەوێت پیشانتی بدەم.

ـ ئێستا؟ بەم پێنجی بەیانییە؟

باوکم بەدەم بێ حاڵی و زەردەیەکی پڕ لەدڵپڕبوونەوە کە پێ ئەچێت لە ڕۆمانێکی ئەلکسەندەر دۆماسەوە وەریگرتبێت وتی:

ـ شتی ئەوتۆی وا هەن کە تەنها ئەتوانرێت هەر بەرەبەیان ببینرێت.

تەنها شتێك کە لەسەر ئەو شەقامە هیلاکانەی ئەو بەرەبەیانە ئەبینرا حەسحەسەکان و تویژاڵی ئەو تەمە بوو، لەگەڵ بەژنی تازە لە خەوهەستاوی رامبلاس کە لە ناو ئەو ڕووناکییە هەڵم لێ هەستاوانەی گڵۆپەکانیدا خۆی ئەکێشایەوە، لە کاتێکدا شار چاوی خەواڵوی

هەڵئەگلۆفی و تویژاڵی وشکی ئەو بۆیاخە ئاویەی سەر ڕوخساری لە خۆی ئەپرواند. ئێمە بەرەو شانۆی کالێ ئارکۆ ڕۆیشتین و دواتر بەردەوامبووین، بەژێر قووبەیەکی نم لێنیشتووی بەیانیدا چووینە ناو ڕاڤێلەوە. تا ئەو کاتەی ڕووناکییەکەی سەر ڕامبلاس لەدوامانەوە ونبوو من لەگەڵ باوکمدا بەناو ئەو شەقامە تەسکانەدا ڕۆیشتم کە زیاتر لە برین ئەچوون وەك لە شەقام. ڕووناکی ئەو بەیانییە بە کونی بەلکۆنەکان و سیمی بەر پەنجەرەکان ئەبێژرایەوە و بە تیشکی خواروخێچ ئەڕژا بەبێ ئەوەی بیدا لە زەوی. لە کۆتاییدا باوکم لەبەردەم دەروازەیەکی گەورەی لەتەختە هەڵکەندراودا وەستا کە بە تێپەڕبوونی کات ڕەش و شێگیرببوو. ئەو جێیەی لەبەردەمیدا وەستابووین لەچاوی مندا لە کۆشکێکی بەجێماو یاخود مۆزەخانەیەك ئەچوو کە پڕبێت لە زایەڵە و تارمایی.
- دانییێل، ئەوەی تۆ ئەمڕۆ ئەیبینیت نابێت بۆ هیچ کەسی باسبکەیت. تەنانەت بۆ تۆماسی هاوڕێشت. بۆ هیچ کەسێك.
دەروازەکە لەلایەن پیاوێکی بچووکی قژ سپییەوە کرایەوە کە ڕوخساری وای لێ ئەکردیت خەیاڵت بۆ باڵدارێکی پڕپیاکراو بچێت. پیاوەکە بە نیگای هەڵۆیەکی حەپەساوەوە سەیری کردم.
باوکم وتی:
- بەیانیت باش، ئیساك. ئەمە دانییێلی کوڕمە. بەو زووانە ئەبێت بە یانزە ساڵ و ڕۆژێکیش دێت کە ئەم سەرپەرشتی دوکانی کتێبی ئەنتیکفرۆشییەکە بکات. ئێستاش تەواو کاتی ئەوە هاتووە ئاشنای ئەم جێگایە بێت.
ئیساك بە سوکە سەرلەقاندنێك تێیگەیاندین بچینە ژوورەوە. هەرچییەك لە ژوورەوە بوو لە شینایییەکی تاریك و ڕوون هەڵکێشرابوو بەجۆرێك بەزەحمەت تێبینی قادرمە مەرمەڕییەکە و ئەو گەلەرییەت ئەکرد کە دیوارەکانی بە فریشتەکان و بوونەوەری ناو حەکایەتەکان پڕکرابوونەوە. هەردووکمان دوای چاوساغەکەمان کەوتین و بەناو داڵانێکی بەهەیبەتدا بردینی کە هۆڵێکی گەورەی خڕی وەك کەنیسەیەکی تاریکی بیرئەهێنایەنەوە، لەویادا ڕووناکی ئەو بەرەبەیانە وەك دەزولەی هەڵم لێهەستاو ئەبوو بە گورزێك و لە سەقنە کەوانەییەکەوە شۆڕئەبووەوە. چی باریکەڕێ و کونج و سەر قادرمە و سەکۆ و سەر پرد و ڕەفەکان



بوون پڕبوون لە کتێب، ژوورەکان سیخناخبوون لە کتێب و بەهەموویان کتێبخانەیەکی زۆر زەبەلاحی ئەندازەیی و مەحاڵیان دروستکردبوو. بەدەمی داپچڕاوەوە سەیری باوکم کرد، ئەویش هاتە پاڵمەوە و چاوێکی لێداگرتم.

ـ دانیێل، بەخێربێیت بۆ گەنجینەی کتێبە لەبیرکراوەکان.

چەندان خەڵك بەسەر پرد و سەر سەکۆکاندا بڵاوبووبوونەوە. هەندێکیان ئاوڕیان لێ ئەدایەنەوە و سڵاویان لێ ئەکردین، من زۆریانم لێ ئەناسینەوە کە هاوڕێی باوکم بوون لە کۆمەڵەی کتێبی ئەنتیکفرۆشییەکە. لە چاوی کەسێکی دە ساڵانەی وەك مندا هەموو ئەوانم وەك دەستەیەکی نهێنی کیمیاگەر ئەبینی کە بە دزیی دنیاوە خەریکی دەسیسەکردنن. باوکم لەبەردەممدا بە چیچکانەوە دانیشت، سەیری چاوی کردم و بە دەنگێکی بەسۆز و باوەڕبەخۆکردنەوە وتی:

ـ ئەم شوێنە تەلیسمێکە بۆخۆی، دانیێل، جێیەکی پیرۆزە. هەر کتێبێك، هەر بەندێك تۆ لێرەدا ئەیبینیت ڕۆحی تیادایە و لەلایەن ئەو کەسەوە ڕۆحی بەبەرداکراوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان نووسیویەتی، هەروەها لەلایەن هەموو ئەو کەسانەشەوە کە خوێندویانەتەوە، هەروەها ئەوانەشی کە هەم تیایدا ژیاون و هەم خەونیان پێوە بینیوە. لەگەڵ گۆڕینی خاوەنی کتێبێك بۆ خاوەنێکی تر، لەگەڵ هەموو خوێنەرێکی تازەدا و چاوپیاخشانی ئەو خوێنەرە بەلاپەڕەکانیدا، ڕۆحی ئەو کتێبە گەورەتر و بەهێزتربووە. لە




ساڵانێکی زۆر زووەوە ئەم جێگایە بوونی هەیە تەنانەت پێش ئەوەش باوکم بۆ یەکەمجار من بهێنێت بۆ ئێرە. ڕەنگە تەمەنی ئەم جێگایە هێندەی تەمەنی ڕۆحی ئەم شارە بێت. کەس بەدڵنیاییەوە نازانیت لەکەیەوە ئەم جێگایە هەیە و کێش دایمەزراندووە. منیش چۆن باوکم بۆی گێڕاومەتەوە ئاوا بۆ تۆی ئەگێڕمەوە. کاتێك کتێبخانەیەك دائەخرێت، کتێبفرۆشییەك نامێنێت، کاتێك کتێبێك ئەکەوێتە فەرامۆشییەوە، ئەو کاتە سەرەی ئێمە دێت، ئێمەی پارێزەرانی کتێب، ئێستا بە چاوی خۆت ئەبینیت ئەم کتێبانە لێرە گیرساونەتەوە. ئەو کتێبانەی کە کەس بیری نەماون، ئەو کتێبانەی لەگەڵ زەمەندا ون بوون، ئەو کتێبانە لێرە ژیانی خۆیان ئەژین و لە چاوەڕوانی ئەوەدان ڕۆژێك بێت بگەنە دەستی خوێنەرێکی تازە و ڕۆحێکی تازە. ئێمە لە کتێبفرۆشییەکەماندا کتێب ئەکڕین و ئەیفرۆشین، بەڵام هیچ کتێبێك بۆخۆی خاوەنی نییە. هەر کتێبێك تۆ لێرەدا ئەیبینیت ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوڕێی نزیکی کەسێك بووە. بەڵام ئێستا ئەوان تەنها ئێمەیان هەیە،

دانییل. تۆ پێتوایە بتوانیت ئەم نهێنییە لای خۆت بپارێزیت؟
نیگام لەناو هەموو ئەو شتە گشتیانەی ناو ژوورەکەدا و لەبەردەم ئەو تیشکە سیحریانەدا شلوێ بووبوو. سەرم لەقاند و باوکم زەردەیەکی بۆ کردم. پرسی:
ـ ئەزانیت باشترین شتێکیش کە لێرەدا هەبێت چییە؟
بەبێ دەنگی سەرم بۆ باوکم لەقاند.
باوکیشم بۆی ڕوونکردمەوە و وتی:
ـ هەر کاتێك کە تۆ بۆ یەکەمجار دێیتە ئێرە وەك نەریتێك ئەبێت کتێبێك بۆ خۆت هەڵبژێریت، هەرچ کتێبێك بتەوێت. تۆ ئەبێت ئەو کتێبە بگریتە خۆت و بەرپرسیاربیت لەبەرامبەریدا و نەهێڵیت هەرگیز بفەوتێت، ئەو کتێبە ئەبێت بەردەوام بژی. ئەمەش سۆزێکی زۆر گرنگە و ئەبێت تا ژیانت بمێنێت بە وەفابیت بۆی. ئەمڕۆش سەرە هاتۆتە سەر تۆ.
منیش بەدرێژایی نیو سەعات بەناو هەموو ئەو پێچ و پەنایانەدا گەڕام و هەناسەم لەناو ئەو بۆنی لاپەڕە کۆن و تۆزاویی و سیحریانەدا هەڵمژی. هێشتم دەستم بەسەر پشتی کتێبەکاندا بخزێت تا بتوانم یەکێکیان هەڵبژێرم. لە ساتی ئەو گەڕانەمدا لەملاو ئەولا ئەمتوانی لەناو ئەو ناونیشانە ڕەنگزەردبوانەدا و لە ڕێی پیتی زمانەکانەوە کتێبەکان بناسمەوە، هەروەها چەندان و چەندان ناونیشانی تر ببینم کە نەم ئەناسین. بەناو پێچ و پەناکاندا ڕۆیشتم تا ئەو سەری گەلەرییەکە و بەلای سەدان و هەزاران کتێبدا تێپەڕیم، کە پێ ئەچوو ئەوان زۆر زیاتر لەسەر من بزانن وەك لەوەی من لەسەریانم ئەزانی. دوای قەیرێك خەیاڵم بۆ ئەوە چوو کە لەناو بەرگی هەر یەکێك لەو کتێبانەدا دنیایەکی بێ سنوور هەیە، ئینسان لە دەرەوەی ئەو ڕێگایانەی کە ئەچن بۆ ناو ئەو کتێبانە ڕێگابەخۆیان ئەدەن ئێوارەکانیان بە سەیرکردنی فتبۆڵێن و گوێگرتن لە دراما ڕادیۆییەکان بەهەدەرەبەرن، سەرباری ئەوەی کە هەریەکەیان هێندەی سەری لوتی خۆی ئەبینێت کەچی لە خۆشی ڕازییە. نازانم کە ئایا هۆی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەم بوو یاخود ڕێکەوت بوو، یان قەدەر بوو کە خزمی نزیکی ڕێکەوتە ئەو بڕیارەی پێدام، لەو چرکە ساتەوە زانیم کە من ئەو کتێبەم هەڵبژاردووە و ئەبێت بیگرمەخۆم. یاخود ڕاسترە بڵێم ئەوە ئەو کتێبە



بوو کە منی گرتە خۆی. بەنەزاکەتەوە بە خۆی و بەرگە چەرمە سوورەکەیەوە خۆی خزاندبووە سوچی ئەوسەری یەکێك لە ڕەفەکان و لەڕێی پیتە ئاڵتونییە شەوقدارەکانی ناونیشانەکەیەوە کە خۆرە بێژراوەکەی ژێر قوبەکە بەسەریدا ئەڕژا کەوتبووە چرپەچرپ. کاتێك لێی چوومە پێشەوە و سەری پەنجەم هێنا بەسەر پیتەکانیدا و ناونیشانەکەیم بەدەمخۆوە بە بێدەنگی خوێندەوە.

سێبەری با
خولیان کاراکس

پێشتر من هەرگیز لەسەر کتێبەکە و نووسەرەکەیم نەبیستبوو، بەڵام ئەوە هیچ گرنگییەکی نەبوو. تازە بڕیارەکە درابوو و بڕیارێکی دوو سەرەش بوو. زۆر بە وریاییەوە کتێبەکەم دەرهێنا و هێشتم لاپەڕەکانی بەژێر پەنجەکانمدا بڕژێن، لەو ڕەفەیەش ڕزگارم کرد کە تیایدا بەندکرابوو، بە دەرهێنانی تۆزێکی زێڕینی لێ هەستا. بە هەڵبژاردنەکەم خۆشحاڵبووم و کتێبەکەم خستە بنباڵمەوە و بەدەم زەردەخەنەوە بەهەمان ئەو





ڕێگا پێچاوپێچەدا گەڕامەوە کە پێشتر پیایدا ڕۆیشتبووم. ئەشێت ئەو کات من کەوتبمە ژێر کاریگەری ئەو کەش و هەوا سیحرییەوە، بەڵام قەناعەتم وابوو هەر ئەم کتێبە خۆی ساڵانێکی زۆرە لەو جێگایەیدا ماوەتەوە و تەنها چاوەڕوانی هاتنی منی کردووە، پێشدەچێت زۆر پێش لەدایکبوونی من چاوەڕێی کردبم.
کاتێك من و باوکم گەڕاینەوە بۆ شوقەکەی کالێ سانتا ئانا دەمودەست بڕیارمدا دەستبکەم بە خوێندنەوەی ئەو دێڕە تازانەی هاوڕێ تازە دۆزراوەکەم. بە پەلە چوومە ژوورەکەم و پێش ئەوەی هیچ شتێك لەو وشانە بزانم کە ئەیانخوێنمەوە چیرۆکەکە وا داگیری کردم کە قابیلی گەڕانەوە نەبوو. کتێبەکە باسی پیاوێکی ئەکرد بەدوای باوکیدا ئەگەڕا. تەنها شتێکیش وایلێکردبوو بزانێت کە باوکی لە ژیاندایە بەهۆی ئەو دواهەمین قسەیەی دایکییەوە بووە کە پێش ئەوەی بمرێت پێیوتبوو. چیرۆکەکە پەرەئەسێنێت تا ئەبێت بە تارماییەکی ئۆدیسی لەکاتێکدا پیاوەکە هەوڵئەدات سەرووەختی منداڵی و هەرزەکارییە لەدەستچووەکەی خۆی دەستبکەوێتەوە، وردە وردەش خوێنەر بەوە ئەزانێت کە کەسایەتی سەرەکی ناو چیرۆکەکە دوچاری عەشقێکی ناموراد بووە و بەدرێژایی عومری بەدوایەوەیەتی. من تا زیاترم ئەخوێندەوە زیاتر بونیادی چیرۆکەکە ئەو بوکەشوشە ڕوسییەی بەبیر ئەهێنامەوە کە بێژمارە لە ناو خۆیدا کۆپی تری تیایە.

چیرۆکەکە لەناو هەزاران لاپەڕەی چیرۆکی تردا ئاوێزان بووبوو، وەك ئەوەی کەوتبێتە ناو هۆڵێکی لە شوشە دروستکراو و شوناسی بەسەر چەندان وێنەی تری ناو ئاوێنەکاندا دابەشبووبێت، لەهەمان کاتیشدا حەکایەتخوان لە باکگروندا ئامادەیی هەبوو. دەقەکان و سەعاتەکان لە هەوادا ئەخولانەوە و ئەڕۆیشتن بەبێ ئەوەی هەستیان پێ بکەیت. من غەرقی ناو کتێبەکە بووبووم و بەزەحمەت گوێم لە دوانزە جار زەنگی کڵێساکە بوو کە کاتژمێر دوانزەی نیوەشەوی ڕاگەیاند، من لە ناو ئەو تیشکە ڕەنگ مسییەی ژێر گڵۆپی چەرپاکەمدا تا ئەهات زیاتر و زیاتر نوقمی ناو دنیایەکی تەواو نادیار ئەبووم لە وێنە و هەست. کەسایەتییەکان وەك ئەو هەوایەی من هەڵم ئەمژین ڕاستبوون و ڕایان ئەکێشامە ناو تونێلێکەوە کە پڕبوو لە ڕاز و سەرچڵی، من ئەمویست لەویادا بۆ هەمیشە بمێنمەوە. لاپەڕە لە دوای لاپەڕە خۆم ئەدا بەدەستەوە و مەفتونی سیحری ناو ئەو چیرۆك و دنیایە بووم، کە هاڵاوی دەمی بەرەبەیان بەر پەنجەرەی ژوورەکەم و چاوە ماندووەکانم کەوت ئەو کاتە من هێشتا چاوم بەسەر دوا لاپەڕەی کتێبەکەوە بوو. کاتێکیش کتێبەکەم لەسەر سنگم دانا و لەژێر ڕووناکی شینی ئەو بەرەبەیانەدا خۆم کێشایەوە گوێم لە خشە خشی ئەو شارە خەوتووە بوو کە بەر سەقفە مۆر و درەوشاوەکەی ماڵەکە ئەکەوت. خەو و ماندوویی لە دەرگایان دام، بەڵام نەم ئەویست بنووم. ئەمویست تاوێکی تر لەناو دنیای ئەو حەکایەتەدا بمێنمەوە و جارێ خواحافیزی ڕاستەقینە لە ئینسانەکانی ناوی نەکەم.

لە یەکێك لەو جارانەدا لە مشتەرییەکی هەمیشەیی باوکمم بیست کە ئەیووت هەندێك شت هەن جێ پەنجەی خۆیان زۆر قوڵ بەسەرماندا بەجێدێڵن وەك ئەو یەکەم کتێبەی کە ڕێگای دڵت ئەدۆزێتەوە. ئەوەش هەر ئەو یەکەمین وێنە و وشانەن کە لەگەڵ داخستنی کتێبەکەدا دوات ئەکەون و بە درێژایی ژیانت وازت لێناهێنن، لە یادەوەریشماندا درەنگ یان زوو خۆیان قایم ئەکەن، ئیتر چەند کتێبت خوێندبێتەوە یان نا، چەند دنیای ترت دۆزیبێتەوە، چەندمان بیرچووبێتەوە و بیرمابێت، هەمیشە ئەو کتێبە بەرەو لای خۆیمان ئەباتەوە. بۆ من ئەو لاپەڕە سیحریانە هەمیشە ئەو لاپەڕانەن کە لەسەر ڕەفەیەکی گەنجینەی کتێبە لەبیرکراوەکان دۆزیمنەوە.





# سەفەرێك بەرەو چین

دانا ڕەئوف

وڵاتی چین یەکێکە لە شارستانییەتە گەورەکانی جیهان و خاوەنی مێژوویەکی دێرین و کولتوورێکی دەوڵەمەندە، چین تەنها وڵاتێکی جیهان نییە، بەڵکو کیشوەرێکە بۆ خۆی و سنووری بە سیازدە وڵاتی ترەوەیە و ژمارەی دانیشتوانی زیاتر لە ، 31 ملیاردە، ڕووبار و دەریاچە، بیابان و دارستان، چیا و جەنگەڵی گەورە، بەرزی و نزمی و هەزارەها گوند و شاری گەورە و بچوك ئەم وڵاتە گەورەیە پێکدەهێنێت. دەمێکە خولیای سەفەرگەلێکی ئەو وڵاتەم، زۆرجار سەیری کتێبە ڕەنگاوڕەنگەکانی چین دەکەم، ئەو شانۆنامانەشی کە لەژێر کاریگەری کولتوور و شانۆی چینیدا نەمایش دەکرێن هێندەی تر ڕەنگ و ئەفسونی ئەم وڵاتەم لەلا گرنگتر دەکات.

هەلێکی وام بۆ هەڵکەوت کە سەردانی چین بکەم، خۆئامادەکردن، بلیت کڕین و فیزا وەرگرتن بە

زوویی هاتن بەدەستەوە و لە 29 ی مانگی دوازدەدا بەرەو وڵاتی چین بەڕێکەوتین1.

**29/ 12**

• بە ڕێگاوە/ شەوی یەکەم لە فڕۆکەدا

بە یەکێك لە فڕۆکە زەبەلاحەکانی چین و هێڵی ئاسمانیی ئایر چاینە **Air China** دەفڕین. کارمەندەکانی ناو فڕۆکەکە بە دەستوبردن، هەمیشە ئامادەن و خزمەتێکی باش پێشکەش دەکەن. هەروەك ئامێر دەجوڵێنەوە و بەهیچ شێوەیەك، هیچ جۆرە پەیوەندییەك، زەردەخەنەیەك، هێمایەکی دەموچاو لەگەڵ سەرنشینەکاندا ناگۆڕنەوە، بەبێ ئەوەی بۆ تەنها ساتێك یان لە چاوتروکانێکدا تەماشامان بکەن، بەبێ دەنگ دێن و دەچن و وەڵامی هیچ پرسیارێکیشمان نادەنەوە، کە سوپاسیشیان دەکەین، ڕوو وەردەگێڕن و ئامێرئاسا لەسەر کاری خۆیان بەردەوام دەبن. خەڵکێکی زۆر لە هەموو سوێدەوە لە فڕۆکەکەدان و ڕاڕەوەکانی نێوان کورسییەکان بووەتە شوێنی گفتوگۆ و یەکترناسین و گێڕانەوەی بەسەرهات، شەو دادێت و هەوڵ ئەدەم سەرخەوێك بشکێنم. منداڵێکی بچوك لەبەردەممدا دانیشتووە، جێگا بەخۆی ناگرێت، نە دەتوانێت داسەکنێت و نە دەشتوانێت بۆ خۆی بنوێت، بەردەوام لەسەر کورسییەکەی سەما دەکات و خەو لە منیش تێکئەدات. لە سوێدەوە کە دەکەوێتە باکووری ئەورووپاوە بۆ چین کە دەکەوێتە ئەوسەری ئاسیاوە، دوو جیهان و دوو کیشوەری جیاوازن، ئێمە بەرەو خۆر دەڕۆین و فڕۆکەکەش بە ئاراستە و نیوەی گۆی زەویدا تێدەپەڕێت، بۆ نموونە کاتژمێری دوازدەی شەو بە کاتی سوێد دەگەینە ئەوێ، بەڵام لە چین کاتژمێری حەوت و نیوی بەیانییە.

**30/12**

سەرلەبەیانییەکی سارد و تەمومژاوی دەگەینە فڕۆکەخانە نێودەوڵەتییەکەی چین، ماندوو و خەواڵوو دێینە دەرەوە و کزە ساردەکە دەموچاو و ڕوخسارمان دەتەزێنێ. وریا دەبینەوە و بە ڕاڕەوە درێژە تاریك و ساردەکانی فڕۆکەخانەکەدا دەڕۆین، دیواری بەرزی چیمەنتۆ و ئەتمۆسفێرێکی وشك، توندوتیژ و سەربازگەلی خانووبەرەی فڕۆکەخانەکەی پێکهێناوە. زوو بەڕێدەکرێین و لەگەڵ ڕێگاپیشاندەرەکەمان دەچینە دەرەوە، ڕێنما و چاوساخێکی چینیشمان هەیە و لە دەرەوە چاوەڕوانمان دەکات.

ئەم چاوساخە چینییە کیژێکی گەنج و جوانە، زیاتر لە بووکەڵەیەك دەچێت، جانتایەکی بچوکی بە پشتیا هەڵواسیوە و پاڵتۆیەکی کورتی ڕەساسی تۆخی لەبەردایە



و بەخێرایی، گورجوگۆڵانە هەڵسوکەوت دەکات. جێگای پێکەنینە، ئەم بووکەڵەیە کە ئەم دوو هەفتەیە ڕێنما و چاوساخمانە، وەك من ناوی "دانا:" یە، بەڵام زوو تێگەیشتین کە دانا ناوێکی خوازراوە و وەك ناوێکی هونەری هەڵیبژاردووە.

دوای نان خواردن دەچین بۆ "گۆڕەپانی ئازادی خودایی"، ئەم گۆڕەپانە 440.000 چوار سەد و چل هەزار مەتر دوجا گەورەیە و یەکێکە لە گەورەترین گۆڕەپانەکانی جیهان و پێگەیەکی مێژوویی هەیە و چەندین ڕووداوی گرنگی تیا ڕوویداوە. هەر لەم گۆڕەپانەدا ماوسیتۆن لە یەکی مانگی دەی ساڵی 1949 دا بانگەشەی کۆماری گەلی چین ـ ی کردووە.

گۆڕەپانی ئازادی خودایی وێنەیەکە بۆ ژیان و شانۆیەکە بە هەموو شێوازەکانییەوە خەڵك و وڵاتێکی گەورەی وەك چین بەرجەستە دەکات. هەر لەم گۆڕەپانەشەوە نەخشە و دروستکردنی شاری پەکین، بنیاتنان و بڵاوبوونەوەی شارەکە دروست بووە. ئەرشیتێکتوری خانووبەرە و سترکتوری شاری پەکین دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خێزان و بنەماڵەی مینگ لە دەوروبەری ساڵەکانی سەدەی سیازدەدا. خەڵکی چین خۆیان بە گەشتوگوزار دێن بۆ پەکینی پایتەخت و لە گۆڕەپانی ئازادی خوداییدا دەسوڕێنەوە، لە مێژووی خۆیان، ڕابردوو و ئێستایان ورد دەبنەوە و دەچنە سەر مەزاری ماوسیتۆن و هەروەك گەشتیارە بیانییەکان گەمە دەکەن، وێنە لەدوای وێنە دەگرن و پاسەوانەکانیش بەبێ جوڵە چاودێرییان دەکەن و لە ئامادەباشیدان بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر جوڵە و بزاڤێکی جیاواز و دژ بە ڕژێم.

هەموو هەست بە ماندووبوونێکی زۆر دەکەین، بە چاوی خەواڵووەوە لەو بەیانییە سارد و تەمومژاوییەدا، بە گۆڕەپانی ئازادی خوداییدا دێین و دەچین. سەرێك بەرز دەکەمەوە و دەڕوانمە ئاسمانێکی ئێجگار گەورە، وەك ئەوە وایە کە ئاسمانی هەموو جیهانت لێوە دیاربێت. گۆڕەپانی ئازادییەکی داگیرکراو و تەنانەت ئەستێرەکانی ئەم ئاسمانە سانسۆرکراون و خەڵکی چین بە ترسەوە سەیری ئاسمان دەکەن و بەدوای ئەو ئازادییەدا دەگەڕێن کە لەو گۆڕەپانە خوێناوییەدا، لەو شانۆ بێ وێنەیەدا داگیرکراوە.

بەهۆی جیاوازی و گۆڕانی کاتەوە، زیاتر لە شەو و ڕۆژێکە نەنووستووین و ماندووبوونەکە بە هەموومانەوە



دیارە، دوای نانخواردن و گوێگرتن لە مۆسیقای میللی چینی، دەگەڕێینەوە بۆ میوانخانەکەمان و بەبێ ئەوەی گوێ بدەمە ڕەنگی ئاسمان، دەنگی باڵندە و ئاوازی مۆسیقای چینی، بەبێ زۆر لەخۆکردن لەناو جێگاکەمدا، بە قووڵی خەوم لێدەکەوێت.

**31/12**

## شارە قەدەخەکراوەکە

بە پاسێك دەچین بۆ ناوجەرگەی شاری پەکین و سەردانی شارە قەدەخە کراوەکە و کۆشکی سیزەرەکان دەکەین، ئەم شارە گەورەترین شوێنەوار و خانووبەرەیە لە هەموو جیهاندا.

شارە قەدەخەکراوەکە لە ساڵەکانی 1421 ەوە دەبێتە کۆشکی شاهانەی چین و نزیکەی پێنج سەد ساڵ، بیست و چوار خێزانی مینگ و کیونگ، یەك لەدوای یەك و نەوە لەدوای نەوە، فەرزەند و باوان لە هۆڵە هارمۆنییەکانی ئەم کۆشکەدا خاوەن دەسەڵات بوون.

لەم ناوچە گەورەیەدا، جگە لە سیزەر و خێزان و بنەماڵەکانیان، هەزارەها دەستوپێوەند و سوپا و سوپاسالارەکانیان ژیاون. شارە قەدەخەکراوەکە بە شورایەکی گەورە و پۆڵایین کە دە مەتر پان و سێ هەزار و چوار سەد مەتر درێژە، دەورە دراوە. ئەم شورایە ڕەنگی سورێکی تۆخە و هەستی گەورەیی و ترسی لەلای خەڵکی دروستکردووە، هەر لەبەر ئەوەش بە شورا سورەکەش ناسراوە. لەپشت شورا سورە پۆڵایینەکەی ئەم شارە پڕ لە نهێنییە قەدەخەکراوەوە، چەندین تاوان، تۆڵەسەندنەوە، خەڵك بەکۆمەڵ هەڵواسین، پیلان و تۆقاندن ڕوویداوە.

دەروازەی ئەم شارە قەدەخەکراوە ئێجگار گەورەیە، خودی دەرگا سەرەکییەکە سی و چوار مەتر بەرزە و لە ساڵی 1651 دا دروستکراوە. دەروازە لەدوای دەروازە و کۆشك لەدوای کۆشك، لە پشت هەر دەروازەیەکەوە، کۆشکێکی گەورە بەرزبۆتەوە. 9999 ژوور لەم شارە ناکۆتایەدا هەیە. خوای ئاسمان دە هەزار ژووری هەیە، لەبەرئەوە کوڕەکەی لەسەر زەوی، کە سیزەری چینە، نابێت ژمارەی ژوورەکانی کۆشکەکەی لە ژمارەی ژوورەکانی خواوەند زیاتر بێت، سیزەرەکان بە نۆ هەزار و نۆ سەد و نەوەد و نۆ و لە دەدا پێنج ژوور رازی بوون. ژوورەکانی ئەم ناوچە کۆشکئاسایە یادەوەرییەکانی پادشاکان، جەنگ، زەمەنێکی درێژ لە فەرمانڕەوایی و ڕووداوی مێژوویی ئەم وڵاتە دەگێڕێتەوە. ناوزەدکردنی ناوچەکەش بە شارە قەدەخەکراوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بنەمایەی کە سیزەرەکانی چین پێیانوابووە کە ئەوان کوڕو وەچەی خواوەندن، هەر لەبەر ئەوە کۆشکەکانیشیان کراوە نەبووە



بۆ خەڵکی ئاسایی. ئەم کۆشکە بە سەربازگەیەکی پڕ لە چەك پارێزراوە و بەهیچ شێوەیەك کەس نەیتوانیوە تەنانەت نزیکیشی بکەوێتەوە.
ئەم شارە لەنێوان ساڵانی 1420ـ1406 دا بنیاتنراوە و ئێستا دادەنرێت بە یەکێك لە مۆزەخانە کراوە و دیارەکانی چین. هەموو شتێك و هەموو کەسێك موڵکی سیزەر بوون و لەپێناوی دەسەڵات و خۆشیی و ئارەزووەکانی ئەودا ژیاون و بچوکترین هەڵە یان کەموکورتییەکی بێ مەبەست، ئەو کەسانەی تووشی مل پەڕاندن کردووە.
بەشی پێشەوەی کۆشکە قەدەخە کراوەکە تایبەت بووە بە دامودەزگاکانی حوکمڕانی، بەشی پشتەوەی بۆ گوزەران و ژیانی تایبەتی خۆیان. باووباپیران لە پانتاییەکانی دەستە چەپ و خواوەندەکانیش لە دەستە ڕاستدا شوێنیان بۆ تەرخانکراوە. لەم شارەدا شارێکی دەرەکی و یەکێکی ناوەکی هەبووە، لە بەشە ناوەکییەکەیدا سیزەر و خێزانەکەی، دەستوپێوەند و کۆیلە و ژنەکانی تری ژیاون، چوونە نێو ئەم بەشەوە ئەستەم و سنووردار بووە.
بەشە دەرەکییەکەش لە دەرگا و دەروازە مەزنەکەی ئەم شارەوە دەستی پێکردووە و ڕووباری یون شویی ئەم دوو بەشە جیادەکاتەوە، لە ساڵی 1795 دا لەلای خۆرهەڵاتی ناوەوەی ئەم شارەدا کۆشکێکیان بۆ کییان لۆنگ – ی سیزەر دروستکردووە، ئەم بەشە زۆر قەدەخەکراو دەبێت و دەبێتە شارێکی قەدەخەکراو لەناو شارە قەدەخەکراوەکەدا. هەر لەم بەشەدا باخچەی پادشا دروستکراوە، ئەم باخچەیە بە شێوازێکی قەشەنگ، نموونەیەك لە ئیشی دەست و پێکداچوون و ئامادەکردنەوەی سروشت و جیهانێکی هارمۆنی ڕۆنراوە.
لەدوای ئەم دەرگایانەشەوە، لەسەری ئەوسەرەوە، باخچەیەکی گەورەی جیاواز بە چەندین چرای سوور ڕازاوەتەوە. لەم باخچەیەدا چەندین ڕووبەری ئامادەکراوی بەردین، درەختی کۆنی پێچاوپێچ، چەمی جۆراوجۆر بۆ ماسی ڕەنگاوڕەنگ و چەندەها گوڵی هەمەچەشنە هەن، هەروەها چەندین فیگوری میتۆلۆژی و پەیکەری بەردین باخچەکەیان ڕازاندۆتەوە. لەم شوێنەدا خێزانی سیزەرەکان پشوویان داوە، گەمەیان کردووە و کاتێکی تایبەت، دوور لە دەسەڵات و تەنانەت دەستوپێوەندە نزیکەکانیشیانەوە بردۆتە سەر.



یەکەم زنجیرە خانووبەرە، لەدوای دەروازە سەرەکییەکەوە کۆشکێکە بەناوی دەروازەیەکی گەورەی هارمۆنی یەکەم سیزەرەکانی قۆناخی مینگ لەم شوێنەدا حوکمڕانییان کردووە. ئەم شارە قەدەخەکراوە تەنها ژووری شاهانە و هۆڵی گەورەی ڕازاوە لەخۆناگرێت، بەڵکو کۆمەڵێ ژووری ساکار و کۆڵانی باریك و تەنگەبەریشی بۆ دەستوپێوەندەکان تێدایە. دوای ئەوە هۆڵە گەورە هارمۆنییەکە و دوابەدوای ئەمانەش هۆڵە مامناوەندییە هارمۆنییەکە دێت و لەم هۆڵەشدا سیزەرەکان پشویان داوە و خۆیان ئامادە کردووە بۆ ڕێوڕەسمی هارمۆنییە گەورەکان.

دوای ئەوە هۆڵی پارێزگاری هارمۆنی دێت. دەروازەی پاکوخاوێنی ئاسمان، دەرگای بەشە ناوەکییەکەی ئەم شارەیە. هەر لەم بەشەدا ماڵی حەسانەوە دێت و سیزەرەکان و بەتایبەتی لەڕۆژی لەدایکبوونیاندا تەماشای ئۆپێرایان کردووە. لەم بەشەی شارە قەدەخەکراوەکەدا شانۆیەکی کۆنی شاهانە کە بە تەختە دروستکراوە، بۆ نمایشەکانی ئۆپێرای پەکین هەیە.

لەسەر سوچی سەربانە بەرزەکانی کۆشك و خانووبەرەکانی ئەم شارەدا، فیگوری ئەفسانەیی دەبینرێت: ئاژەڵ، باڵندە، مرۆڤی ئاسایی یاخود سەرباز و سوارچاك و جەنگاوەرەکان. ئەم کۆشکە گەورەترین خانووبەرەکانی ئەم شارەیە و جیهانێکە لە فیگورەکانی ئەژدیهای گڕهاوێژ و میتۆلۆژیا چینییەکان. هەر لەم کۆشکەدا بەشێوەیەکی تەواوەتی وێنەی دە ئاژەڵە نهێنییەکان پارێزراون، ئەمەش تاکە شوێنێکە لەهەموو چیندا کە ئەم دە وێنەیەی تێدا پارێزرابێت. ئەم وێنانە بە ساپیتەی ژوورە گەورەکەدا دروستکراون، وێنەکان خۆیان هەمیشە بەشێوەی تاك دانراون: سێ، پێنج، حەوت یان نۆ، بەڵام لێرەدا هەر دەیان وەك گروپێکی پێکەوە بەستراو، وێنەکێشراون.

سیزەر و پادشاکانی چین لەنێوان ساڵانی **1420-1911** لەم شارەدا حوکمڕانییان کردووە.

## پەرستگەی ئاسمان

لە شارە قەدەخەکراوەکەوە ڕاستەوخۆ دەڕۆین بۆ پەرستگەی ئاسمان کە لە کۆمەڵێ خانووبەرەی گەورە پێکهاتووە و لە ناوەڕاستی باخچەیەکی گەورەدا بڵاوبووەتەوە، لە چینی کۆندا ئاسمان و زەوی وەك خواوەندێکی گەورە تەماشاکراوە. تەنیا گیانلەبەرێکی زیندوو کە توانیویەتی لە ئاسمان نزیك بێتەوە، پادشا و سیزەرەکان بوون، کە کوڕی ئاسمانن.

ئەم پەرستگەیە بە بڵندگۆ و ساپیتە شینەکەیەوە، یەکێکە لە گرنگترین شوێنەوار و پاشماوە دێرینە گەورەکانی چین و بەشێکە



لە زنجیرە پەرستگەیەك كە دوو ملیۆن و حەوت سەد هەزار مەتر چوارگۆشەیە، تەنانەت لە شارە قەدەخەكراوەكەش گەورەترە. سیزەر و پادشاكانی چین كە بە كوڕی ئاسمان ئاماژەیان بۆ كراوە، نەیانوێراوە كۆشك و شارە گەورەكانی خۆیان لە ڕووبەر و پانتاییەكانی ئەم پەرستگەی ئاسمانە گەورەتر دروست بكەن. ئەم زنجیرە پەرستگەیە بە شورایەك چواردەر دراوە كە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەست پێدەكات و بە شێوەیەكی بازنەیی لە باشورەوە كۆتایی دێت، ئەمەش هێماگەلێكە بۆ زەوی و حەوت تەبەقەی ئاسمان.

دەچینە هۆڵی پەرستن یان پەرستگە، لەم شوێنەدا پادشاكان كە كەس نەیوێراوە تەماشایان بكات، لەسەر چۆك دانیشتوون و لە خواوەند پاڕاونەتەوە، قسەیان لەگەڵ ئاسمان كردووە و داواكارییەكانیان پێشكەش بە جیهانە پڕ لە ڕاز و نهێنییەكان كردووە.

شوینەكە ڕواڵەتە پیرۆزەكەی خۆی تا ئێستا پاراستووە و مرۆ هەست بە چاوێكی نهێنی دەكات و بێدەنگییەكی سەرتاسەری ئەو ژوورە گەورەیەی گرتۆتەوە. ئەم هۆڵە تەنها شوێنێكە لە هەموو چین دا كە ساپیتەكەی شینە، ئەمەش هیماگەلێكە بۆ ئاسمان و ڕواڵەتەكانی پەرستن. ئەو بیست و چوار پایەیەی كە ساپیتەكەی ڕاگرتووە هێماگەلی چوار وەرزی ساڵ، دوازدە مانگی ساڵ و بیست و چوار كاتژمێری بەدوای یەكداهاتنی شەو و ڕۆژە. خودی خانووبەرە پێچاوپێچەكە كە سی و هەشت مەتر بەرزە، لەسەردەمی بنەماڵەی مینگ ـ دا دروستكراوە.

لە پەرستگەی ئاسمانەوە دەچین بۆ ڕاڕەوێكی ساپیتەداری تەختە و پیاسەیەكی دوورو درێژ دەكەین. ئەم ڕاڕەوە نزیكەی یەك كیلۆمەتر یان زیاتر درێژ دەبێتەوە، دەچن بەیەكدا و یەكتر تەواو دەكەن و پایەكانی ئەملاوئەولای ساپیتەكەش ڕەنگیان سورە. لەلای خۆرهەڵاتەوە چەمێكی شین درێژبۆتەوە، لە باكووریشەوە چیایەكی بەرز بە چەندین خانووی بچوك و لاخانو ڕازاوەتەوە و ساپیتەكەش هەزارەها وێنەی جوانی تیاكێشراوە، وێنەكان هیچكامێكیان لەویتریان ناچێت و پێشانگەیەكی گەڕۆكیان پێكهێناوە. نزیكەی دە هەزار تابلۆ بەم ساپیتەیەوە دروست كراوە، موتیڤی تابلۆكان لە مێژوو، ئەدەب و میتۆلۆژیای چینەوە



وەرگیراوە.
ئەوسەری ڕاڕەوەکە مۆزەخانەیەکی دێرینی کاتژمێرە و هەزارەها کاتژمێری جۆراوجۆر و لە زوربەی وڵاتانی دنیاوە، بە تایبەتی بەریتانیا، فەرەنسا، سویسرا و چین خۆی لەخۆدەگرێت. کەلوپەل و کاتژمێرەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خێزان و بنەماڵەی ـ کیونگ و جگە لە کاتژمێر چەندین کاری هونەری و هەڵکۆڵینی چینی و ڕۆژئاوایی تیادایە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان دیزاینی کۆنی چینی و تەکنیکی ڕۆژئاوا لەخۆدەگرێت. هەرچەندە کات لەم مۆزەخانەیەدا وەستاوە، بەڵام بۆ من دەبێتە بوونێکی مادی و لە خودی ئەو کاتژمێرە کۆنانەوە بیر لە تەرزی ژیان و لەو زەمەنە دەکەمەوە کە کاتژمێرەکانی تێدا دروستکراوە. دەنگی چرکەچرك و زەنگی کاتژمێرەکان بەنێو سەردەم و سەدە جیاواز و خەڵکە هەمە چەشن و جلەبەرگەکانیاندا دێت و دەچێت، لە گوێیەکانمدا دەزرنگێتەوە و دەمباتەوە بۆ ئەو کاتە دوور و بەسەرچووانە.

## شانۆ لە چین

وڵاتی چین وەك کیشوەرێکی ڕۆژهەڵات هەر لە مێژە شانۆیەکی تایبەتمەندی خۆیان هەیە، شانۆی ڕۆژهەڵات، بەتایبەتی چین، ژاپۆن و هیندستان یەکێکە لە ڕەچەڵەکە هەرە دێرینەکانی ڕۆشنبیری، فەلسەفە، شارستانییەتی جیهانی کۆن، هێماگەلێکە لە هێماکانی بەردەوامی و فەلسەفەی بوون. جۆریك لە ڕیتواڵێکی پیرۆزی دینی و جیهانێکی نهێنی و قووڵ و شکۆمەند لەخۆدەگرێت، جیهانێکی هەستئامێزی بەرزە، هێما، ئاماژە، سەما، مۆسیقا و زمانێکی جەستەیی دەربڕینئامێز، ریشاڵە نهێنییەکانی ئەو ڕیتواڵە شانۆییانە پێکدەهێنێت، هەر لەسەرەتاوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە بینەران لەو میحرابەوە ڕووبەڕووی خۆدی خۆیان و نهێنییەکانی سروشت و هێزەکانی خێر و شەڕ بوونەتەوە.
من و هاورێکەم لە گروپەکەمان جیادەبینەوە، من نازانم نەخشە بخوێنمەوە، بەڵام ئەوە بە باشی لە هونەری نەخشە خوێندنەوە دەزانێت و بەهۆی ئەو نەخشەیەی بەدەستمانەوەیە، لە شارێکی ئێجگار گەورەی وەك پەکین دا دەگەڕێین تا ماڵبەندی پەکین ئۆپێرا دەدۆزینەوە. شانۆکە جوانە و خانووبەرەکە لە هونەری بیناسازی چینە و لە سەرەتای هەزار و هەشت سەدەکانەوە نەمایشی تیا پێشکەشکراوە. لە ڕووکاری دەرەوەی شانۆکەشدا، مۆزەخانەیەکی بچوکی تێدایە.
دوای خۆناسین و مۆڵەت وەرگرتن دەچینە ژووری یەکێك لە مەشقەکانیان. ئەکتەرەکان بە داری درێژ گەمەی ئەکرۆپاتیك دەکەن، پرۆڤەی هونەری بەرەنگاربوونەوە، جەنگی دەست و یەخە و ئاماژەکانی دەست و سیمای دەموچاو دەکەن. کەم دەدوێن و



ڕیژیسۆرەکەشیان هەر بە جوڵە و هەندێك جار بە بۆڵەبۆڵ جوڵانەوەیەك، یان حاڵەتێكی فیزیكییان بۆ بەرجەستە دەکات.

بەشێوەیەكی بەرنامە بۆ داڕێژراو بە چڕی کاردەکەن و لە جوڵە و بزاڤەکانیاندا گورجوگۆڵن، خێران و دەیانەوێت فێڵ لەچاوی بینەران بكەن. ئەمە هونەری جەستەیە، جەستەیەك بە هەموو ئەندامەکانییەوە و لەچاوتروکانێكدا گۆڕانکاری بەسەردا دێت و کرداری توندوتیژ، بەشێوەیەكی هونەری و ئیستاتیكی بەئەنجام دەگەیەنێت. دەنگ، هاوار و گۆرانی دەکەنە بەشێكی کردەکانیان و وەك پەرچەکردارێك ئەو کۆریۆگرافیا جەستەییەی لێ بەدیدێت. ئەمەش بەتەواوەتی بە پێچەوانەی شانۆی ڕۆژئاواوەیە کە لەسەر بنەماکانی ڕیالیزم و فاکتەرە دەروونییەکان کار دەکەن.

گروپەکە خەریكی ڕاهێنان و خۆئامادەکردنی ئەو شانۆنامەیەن کە ئێمە ئەم شەو بلیتمان بۆ بریوە و پێکەوە هەموومان دەیبینین.

ئەوان بە دڵێكی فراوانەوە دەرگاکانمان بۆ دەکەنەوە، پرۆڤەکانیان دەبینین، دواتریش لەگەڵ ڕیژیسۆرەکەیان، بە زمانی ئاماژە، جەستە و ئەو ئینگلیزییە شەق و شڕەی کە دەیزانێ قسە دەکەین، بەڵام ئینگلیزییەکەی ئەو، بە هەموو تێكشکاوییەکییەوە لە ئینگلیزییەکەی من باشترە. هاوڕێکەم کە نووسەر و شانۆکاریشە ئینگلیزییەکی باش قسە دەکات و یارمەتی لەیەکتر تێگەیشتنمان دەدات.

ئەم ڕیژیسۆرە چینییە کە ناوی یانگ نونگ ـ ە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ترادیشونی شانۆی چینی لەسەر ئەوە بنیاتنراوە کە هەموو سنورەکانی نێوان تێکست، مۆسیقا، نواندن و سەما لابراوە و ئەم توخمانە هەمیشە لە یەکەیەکی هونەریدا کۆبوونەتەوە. هەموو شتێك کە لەسەر شانۆ لە ئۆپێرای پەکین ڕوودەدات، دەبێت لە هەموو ڕوویەکەوە بەشێوەیەکی دروست و باڵا ئامادەکرابێت، هەموو جوڵانەوەیەك دەبێت هەست و فەنتازیای بینەران بوروژێنێت.

نەژادی ئەم هونەرە لە سەمای میللی، شێوازە جۆراوجۆرەکانی گۆرانی و بەسەرهاتە کۆنەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، مۆسیقا، گۆرانی، سەما، تەکنیكی جەنگ، ئەکرۆپاتیك، پانتۆمایم، هونەری ئیشی دەست



لە فۆرمێکی یەکگرتوودا تواونەتەوە و هونەرێکی تری تایبەتمەندی خوڵقاندووە. لەم هونەرەدا کە بە چینی بە پینگیو ناوزەد کراوە و لە ڕۆژئاوا بووە بە ئۆپێرای پەکین، هەرگیز ژیان، ڕووداو و جووڵانەوەکان لە بنەما ناتورالیستی و ریالیستییەکەیەوە ناخرێتە ڕوو. هەموو شتێك لە ڕووبەرێکی فەنتازی ئامێز و جیهانی میتۆلۆژیایەکی بێسنووردا دەسوڕێتەوە، لەو جیهانە میتۆلۆژییەدا خواوەندەکان، جادووگەر و مرۆڤی ئاسایی شان بەشانی یەکتر دەردەکەون.

ڕەنگ بەهایەکی تایبەتی هەیە لە دیاریکردنی جلوبەرگەکانیاندا، ئەو جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگانە لەنێوەندی مۆسیقا، ئەکرۆپاتیك، کۆریۆگرافی، جەنگ و پێکدادان، گۆرانی و دیالۆگدا دیمەنێکی بی وێنە فەراهەم دەکەن. بەڵام لەو نێوەندە ئەفسوونییەدا مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی زیندوو، سەربەخۆ، ئامادە، ئامرازی هەموو پەیوەندییەکانە، مرۆڤ جەستەیەکی کارامە و بزۆز و درەوشاوەیە[2].

کاتژمێر حەوتی ئێوارە گروپەکەمان دەگەنە شانۆکە و کاتژمێر حەوت و نیو نەمایشەکەیان پێشکەش دەکەن. نەمایشەکە هەڵبژاردەیەکە لە سێ ئۆپێرای جیاواز، سەرەتا وەك سێ بەشی سەربەخۆ و دواتر هەر سێ بەشەکە لە تێکئاڵان و پێکداچوونێکی پێکەوە بەستراودا دەبێتە نەمایشێکی سەربەخۆ.

دە و نیوی شەو لە ئۆپێرای پەکین دێینە دەرەوە، دنیا بە تەواوەتی تاریکی کردووە و کزەبایەکی ساردیش تەنگی پێهەڵچنیوین. هەموو تەماشای یەك دەکەین و نازانین چ بڕیارێك بدەین، ئەم شەو بەکاتی چین شەوی سەری ساڵە. بەڕێکردنی ئەم ساڵ و پێشوازیکردن لە ساڵی نوێ ساتگەلێکی تایبەتمەندە و دەمانەوێت لێرەش ئەو یادە بکەینەوە. هیچ پرۆگرامێکمان نییە، هەموومان ماندووین و پرۆگرامی بەیانیش چڕ و دوور و درێژە. تەنها بڕیاریش ئەوەیە کە بگەڕێینەوە بۆ میوانخانەکەمان و بنووین و سبەی بەیانی کاتژمێر حەوت و بەر لە چوونە دەرەوەمان کە دەکاتە دوازدەی شەو بە کاتی سوێد ئاهەنگەکەمان بگێڕین.

**1/1**

لەگەڵ کازیوەی بەیان هەستاوین، لە هۆڵە گەورەکەی میوانخانەکەمان کۆدەبینەوە و شەراب و شەمپانیا ئامادەکراوە و لەگەڵ زەنگی حەوتی بەیانی سەری ساڵی تازە لەیەکتر پیرۆز دەکەین و هەریەکە دەچێتە ئامێزی هاوڕێکەیەوە و ئەتمۆسفێرێکی پڕ لە هارمۆنی لەو کەشە نامۆیەدا دەبێتە چرکەساتێکی لێوانلێو لە خۆشەویستی.

چینی نوێ بەیادی سیزەرەکانییەوە دەژی، کۆ مۆ نیستە کا ن وێنەیەکی تری ڕژێمی بنەماڵە و خێزانە دەسەڵاتدارەکانی ئەم



ولاتەن و هەر لەبەر ئەوەشە گرنگییەکی بێ هاوتا دەبەخشنە ئەو شوینەوارە دێرینانە. ئارامگە و گۆڕی سیزەرەکان بووەتە جێگای گەشتیاران و سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی داراییش بۆ ئابووری ئەم ولاتە.

گۆڕی سیزەرەکان و بنەماڵەی ـ مینگ

بەرەبەیانی یەکەم رۆژی ساڵی تازە بەرەو دوا ئارامگە و گۆڕەکانی سیزەر و خێزان و بنەماڵەی ـ مینگ بەڕێدەکەوین و لەدوای سەعات و نیوێك دەگەینە شوینی مەبەست.

سیازدە لەو شازدە سیزەرەی بنەماڵەی ـ مینگ لە دۆڵێکی گەورەدا کە پەنجا کیلۆمەتر لە باکوری خۆرئاوای پەکینەوە دوورە، نێژراون و بەشێك لەم گۆڕانە، سی هەزار کەس کاری تێداکردووە و بە شەش ساڵ تەواوکراوە. شوێنەکە بەوپەڕی بایەخپێدان و گرنگییەوە هەڵبژێردراوە. چیایەك لە پشتی ئەوسەری دۆڵەکەوە بەرزبۆتەوە و گیانی سیزەرەکان لە ڕەشەبا و ڕوبارە تووڕەکان دەپارێزێت و ئەو ڕووبارەشی دەڕژێتە دامێنی چیاکەوە، هەموو کارەساتێك لەگەڵ خۆی ڕادەماڵێ.

هەموو گۆڕەکان چونیەکن و بەباشی پارێزراون، لە دەسپێکی ئەم گۆڕستانەدا و لە دەروازەیەکی باریکەوە دەچینە هۆڵی یادەوەرییەکان و گردی گۆڕەکانیش دەکەوێتە بەشی دواوە. لە سەردەمە دێرینەکاندا، ئەم گۆڕانە و هەموو ناوچەکە بە شورایەکی سی و پێنج کیلۆمەتری دەورەدراوە، کە سیزەرەکانیش مردوون، بە کەژاوە لاشەکەیان لە شارە قەدەخەکراوەکەوە گوێزاوەتەوە بۆ ناوچەی گۆڕستانەکە. لە سەرەتادا ئەو کەژاوە شکۆدارە بە بەردەمی پەیکەرێکی بەردیندا تێپەڕیوە کە لە هەموو چین دا لەم پەیکەرە گەورەتر نییە، دوای ئەوە و بەرلەوەی بگەینە هۆڵی یادەوەرییەکان کە بە تابلۆیەکی بەردینی گەورە بەرگری لێدەکرێت، دەرگا سوورە گەورەکە دێت. لەم دەرگایەوە سیزەرەکەیان بە ڕێگەیەکی هەشت سەد مەتریدا بردووە کە بە دوا ڕێگە ناوزەدکراوە. ئەم ڕێگەیەش دەروازەیەکی پیرۆز بووە و لەوێوە سیزەرەکان گەڕاونەتەوە بۆ ئاسمان.



یەکێك لە دوا ریگەکان کە بەرەو گۆڕەکان دەچێت، بە فیگوری بەردین پارێزگاری دەکرێن: دوازدە مرۆڤ، سەرباز و پیاوی دەوڵەت، بیست و چوار ئاژەڵ، شێر، حوشتر، فیل، ئەسپ و ئاژەڵی میتۆلۆژی، لەهەر جۆرە ئاژەڵێك چوار دانە هەیە، دوانیان بە پێوەن و دوانەکەی تریان بە دانیشتنەوە. لەلای ڕاست و چەپی ئەم گردی گۆڕانەوە شازدە ئافرەتی گەنج کە موڵکی ئەو پادشایە بوون، نێژراون. ئەم ئافرەتانە وەك کۆیلەی سێکسی وابوون و لەگەڵ مردنی هەر سیزەرێکدا، ئەوانیش زیندەبەچاڵ کراون تا لەگەڵ ئەواندا بڕۆن و چۆن لە ژیاندا لەگەڵیاندا بوون، ئەوا دەبێ لە مەرگیشدا هەر لەگەڵیاندا بن.

شورای چین

دوای مەزاری سیزەرەکان بەرەو شورای چین کە دەکەوێتە باکووری شاری پەکینەوە، دەڕۆین. ئەم شورایە هیچ هێزێك بەری پێناگرێت، لە خۆرهەڵاتەوە زیاتر لە شەش سەد میل بەرەو خۆرئاوا، بەسەر چیا و ناو دۆڵەکاندا، بە کەناری دەریا و بەناو شیو و بیابانەکاندا، ئەو شورا گەورەیە بەنێو هەناوی سروشتدا درێژبۆتەوە.

یەکەم سیزەرەکانی بنەماڵەی کین شی هیوانگ لە ساڵەکانی دوو سەدی بەر لەدایکبوونی مەسیحدا بڕیاری دروستکردنی ئەم شورایە ئەدات، لە سەرەتادا چەندین شورای کورت کورت، لێرە و لەوێ و بۆ بەرگریکردن ڕۆنراون، لەبەرئەنجامدا ئەو شورایانە پێکەوە دەبەستنەوە و دەبێتە شورای چینی مەزن. ئەم شورایە لەنێوان ساڵانی 1300ـ1600 ەکاندا و لەکاتی حوکمڕانی بنەماڵەی کین دا تەواو دەبێت.

لە تاوەری پاسەوانەکانەوە بە ئاشکرا ئەو شورا درێژە دەبینین کە وەك هەژدیهایەك بەسەر چیاکاندا سەردەکەوێت و لەسەر ترۆپکە بەرزەکانەوە ڕووە و ئاسمان بە سەرێکی بڵندەوە دەڕوانێت و دواتر بەرەو خوار درێژدەبێتەوە، تا بە تەواوەتی لە چاو ون دەبێت. نزیکەی بیست و چوار هەزار تاوەری پاسەوان و سەربازی بەسەر ئەم شورایەوە دروستکراون. زوربەی زۆری بە شێوەیەکی تەواوەتی پارێزگاری لێکراوە و وەك خۆیان ماونەتەوە، هەندێکیشیان داڕوخاون و تەنها چوارچێوەکەیان ماوە.

چین لە باکوورەوە هەمیشە کەوتۆتە بەر هێرشی نومەدەرەکان، کە دەکاتە مەنگۆلیای ئێستا، ئەم هێرشانە شەڕ و پێکدادان و کوشتارێکی زۆری لێکەوتۆتەوە، چینیش بۆ پاراستن و بەرگریکردن لە خۆیان، بڕیاری دروستکردنی گەورەترین و درێژترین شورا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەدەن، ئەم شورایە زیاتر لە چوار هەزار کیلۆمەتر درێژە و بە چینیی پێیدەوترێت



(شورا دە هەزار لی – یە درێژەکە) یان شانگ شێنگ، واتە "شورا درێژەکە"3.
ئەم شورایە حەوت تا دە مەتر بەرزە و لە نێوانی 7-3، 5 مەتریشدا پانە.
ڕەشەبایەکی سارد ریگای هەنگاوەکانمان پێدەگرێت و خۆڵ و تەپوتۆز دەچێتە دەموچاومانەوە، سەرمامە و تیشکی ڕۆژەکە ناتوانێ گەرممان بکاتەوە. لە دەروازەی شوراکەدا و بەرلەوەی بڕۆین، کڵاوێکی فەروو دەکڕم تا لە ڕەشەبا و سەرماکەش خۆم بپارێزم.
نزیکەی یەك کیلۆمەتر بە شوراکەدا هەڵدەگەڕێم، هەندێك جار بە شێوەی قاڵدرمەی بەرز و نارێکوپێك و هەندێك جاری تر بە شێوەی تولەڕێی پێچاوپێچدا سەردەکەوم. بەشێك لە قاڵدەرمەی پاسەوانەکان داڕووخاوە، ئاماژەیەکە بۆ شوێنەوارێکی دێرین و لەهەمانکاتدا ئەم قاڵدرمە سەربازییە ماندووانە هیماگەلی بەسەرچوونی ئەو سەردەمەیە.
خەڵکێکی زۆر و لە هەموو نەتەوەیەك لەگەڵ ئەو ڕەشەبا ساردەدا دەجەنگێ و بە هەنگاوی قورس و خاو سەردەکەون، چەندە بەرز ببینەوە هێندە ڕەشەباکە توندتر دەبێت و خۆم بە شیشی لادیواری ناوەوەی شوراکەوە دەگرم و هێز ئەدەمە بەرخۆم تا ترۆپکی ئەو بەشەی شوراکە دەڕۆم. لە سەرەوە سەیرێکی ئاسمان، دەوروبەرەکەم، ئاسۆگە دوورەکان، دۆڵەکانی خوارەوە دەکەم، هێز و ئەفسوونی ئەم شورا مەزنە لەم چاوتروکانەدا دەبێتە واقیعێکی هەستپێکراو و پڕ لە ژیان.
کە دێمە خوارەوە، ڕەشەباکە لە پشتەوە پاڵم پێوە دەنێت و بە ئاسانی غلۆر دەبمەوە، بەدەم ڕێگەوە بیر لەو وزە گەورەیە دەکەمەوە کە مرۆڤ هان دەدات شورایەکی ئاوها دروست بکات، شتێکە لە دەرەوەی توانا سروشتییەکانی مرۆڤدایە.
کە بە شوراکەدا دێمە خوارەوە، وەك ئەوە وایە کە بەنێو ڕاڕەوەکانی ئەو مێژووە دێرینەی وڵاتی چیندا بڕۆم. ئەندێشەم دەمباتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارانە، بۆ لای ئەو کرێکار و کۆیلە و زیندانیی و سەربازانەی کە بە هاوین و زستان ئەم شورایەیان ڕۆناوە، بیرم لەو سەربازانە دەکردەوە کە شەو و ڕۆژ پاسەوان بوون و بە دڵێکی ڕەق و مامەڵەیەکی توندوتیژەوە هەوڵی زووتر تەواوکردنی ئەم شورایەیان داوە. ڕەشەبا توندەکەی ئەمڕۆ، ئەو ڕەشەبا خۆڵاوییەم دێنێتەوە



بەرچاو کە لەکاتی دروستکردنەکەدا، بێ بەزەییانە، بە بارانێکی خوڕەوە ئەو خەڵکەی پێ بریندار کردووە. هەزارەها کەس لەکاتی دروستکردنی ئەم شورا گەورە مێژووییەدا ژیانیان لەدەستداوە و لاشەکانیان لەگەڵ بناخە و دیوارە بەردینییەکاندا بێ بەزەییانە شاردراونەتەوە و بوونەتە بەردێك، مشتەخۆڵێك و بەشێك لە بناخەی شوراکە. ئەم شورایە بە ئارەقەی ناوچەوان و خوێن و گۆشتی هەزارەها کەس ڕۆنراوە و زۆر بە ئاسانیش پشتی کردۆتە قوربانییەکانی.

**2/1**

لەگەڵ کازیوەی بەیانیاندا، لەنێوان تاریك و ڕووندا، خەڵکێکی زۆر بە کۆمەڵ پیاو، ژن و منداڵ لە پارکەکاندا، لەسەر شەقام و شوێنە گشتییەکاندا، لەسەر ڕیتمێکی پڕ لە هارمۆنی و پێکەوە جوڵانەوەیەکی جەستەیی سەمائامێز، وەك وەرزشەوانەکان دەکەن و بووەتە بزوتنەوەیەکی میللی بەربڵاو.

ئەم ڕەهەندە بنەمایەکی فیکری هەیە و بە تای شی ناودەبرێت و ڕژێمی چین بەرهەڵستییان دەکات.

لە میوانخانەکەمان دێینە دەرەوە، کات هێشتا نەبووەتە حەوت و نیو، تەمێکی چڕ لە فەزای گەردوونەوە، بە قورسی باڵی کێشاوە بەسەر شەقامەکاندا و تای شی زانەکانیش، لەم تەمومژەدا وەکو سێبەر دەجوڵێنەوە و تابلۆیەکی جوانیان بە جەستەیان دروست کردووە و لە دیمەنی فیلمێکی سینەمایی دەچێت. لە پەنجەرەی پاسەکەمانەوە تەماشایان دەکەم و بە خێرایی بەلایاندا تێدەپەڕین، تا چاو بڕ بکات و توانای تەماشاکردنم هەبێت، لێیان دەڕوانم.

## باخچەی ئاژەڵان

کە پاسەکەمان لەبەردەم باخچەی ئاژەڵاندا ڕادەوەستێت، بەتەواوی خۆر هەڵاتووە و تەمەکەش لە تیشکی ڕۆژەکەدا تواوەتەوە **4**. باخچەی ئاژەڵان ئێجگار گەورەیە و بەر لە سەد ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە و تەنها بەشێکی بچوکی نەبێ دەنا فریای بینینی هەمووی ناکەوین. خودی باخچەکە لەسەر ئاسەوارە کۆنەکان ڕۆنراوە. لەبەرئەوە لێرە و لەوێ بناخە و بنەما سەرەتاییەکانی هەندێ شوێنەواری کۆنی خانووبەرە و کۆشکی سیزەرەکانی تیاماوە. هەروەها دەریاچەیەکی دەستکردی گەورەشیان تێدا دروستکردووە، لەم دەریاچەیەدا چەندین دۆلفینی تێدایە و بە ڕاهێنەری تایبەتمەند گەمەیان لەگەڵ دەکەن و خەڵکێکی زۆریان لە دەور کۆدەبنەوە.

لە باخچەی ئاژەڵان دێینە دەرەوە، بە پێچەوانەی ئاراستەی ئێمەوە هەزارەها خەڵکی چین بەرەو



دەرگاکانی باخچەکە هەنگاو دەنێن. باخچەی ئاژەڵان وەك سەیرانگا وایە بۆ ئەوان و کاتی پشووی تێدا دەبەنە سەر و لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەبنە هاودەمی ئەو ئاژەڵ و باڵندانەی لە باخچەکەدان.

## کۆشکی هاوینە

لە باخچەی ئاژەڵانەوە دەڕۆین تا لە باکووری دەروازەی شارەوە دەچینە دەرەوە و خۆمان دەگەیەنینە کۆشکی هاوینەی سیزەرەکان.

ئەم کۆشکە وەك هەموو شوێنێکی تری ئەم وڵاتە، گەورەیە، هەموو شتێك گەورەیە و ئەمەش هیماگەلێکە بۆ دەسەڵات و گەورەیی وڵاتەکە. لە باخچە بێ سنوورەکەی ئەم کۆشکەدا ڕووبەڕووی دوا ڕۆژەکانی ژیانی سیزەرەکان دەبینەوە، کین - ی سیزەر ئەم کۆشکە گەورەیەی دروستکردووە تا لەدەست گەرمای هاوینی پەکین ڕابکات و بێتە ئێرە.

کۆشك و باخچەکە سادەن و وێنەیەکی هونەری چۆنییەتی باخچەی چین لەخۆدەگرێت و چەم و دۆڵ و گردۆڵکەی ناوچەکەیان بەکارهێناوە بۆ دروستکردنی باخچەیەکی گەورەی سروشتئامێز.

بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەم کۆشکە تەرخانکراوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی و کاروباری دەوڵەت، هەر لەم بەشەشدا پێشوازی لە میوانەکان کراوە و ئێستا بووەتە جێگای تەراتێنی گەشتیاران. ئەندازە و خانووبەرە و باخچە و ئەرشیتێکتوری دروستکردنی کۆشکەکە، ستایل و شێوازەکانی هەموو خانووبەرەی چین لەخۆدەگرێت: بۆ نموونە بەشی لای سەرەوەی بە جۆرە ستایلی هونەری باکووری چین دروستکراوە، بەڵام باخچە و چەم و دارودرەختەکانی خۆرئاوا ستایلی باشووری چینە و خانووبەرەکانی باکوریش بە شێوازی تێبێت دروستکراوە.




لە سەدەی نۆزدەدا سیکسی **Cixi** بێوەژن دەسەڵاتێکی گەورەی لەم کۆشکە هاوینەیەدا هەبووە، لە بەشی باکووردا شانۆیەکی تایبەتمەندی بۆ دانراوە و بە درێژایی شەو و ڕۆژ تەماشای شانۆی کردووە و هەندێك جار خۆیشی ڕۆڵی لەگەڵ ئەکتەرەکاندا بینیوە.

شانۆکە دەکەوێتە باخچە هارمۆنییەکەوە و

ئێستا مۆزەخانەیەکی بەبەهای شانۆشیان تێداکردۆتەوە، لەم مۆزەخانەیەدا چەندین شتی گرنگی ئەو سەردەمەی تێداپارێزراوە، بۆ نموونە بەشێك لە کەلوپەلە تایبەتمەندەکانی سیکسی بێوەژن، ئامێری مۆسیقا، دەستنووس، جلوبەرگ، دیکۆر، شانە و ئاوێنەی ئەکتەرە بەناوبانگەکان، شووشەی عەتر ... و

بەو ڕاڕەوە حەوت سەد مەتر درێژەدا دەگەڕێم، کە بەشێکی زۆری کۆشکەکە پێکەوە دەبەستێتەوە، ساپیتەی ڕاڕەوەکەش هەزارەها وێنەی جۆراوجۆری تێداکێشراوە. لە وێنەکان ورد دەبمەوە، مۆتیڤی میتۆلۆژی، سەرگوزشتەی دێرینی گەلی چین، ژیانی پادشا و سیزەرەکان، جۆرەکانی ڕیتواڵ و لە خواوەند پاڕانەوە، جەنگ و پێکدادان و بە ڕەنگی زەق و گەرم کێشراون. کە دەگەمە ئەوسەری ڕاڕەوەکە، ڕووبەڕووی شانۆیەکی دێرینی بە تەختە دروستکراو دەبمەوە، شانۆکە بچوکە، سەر تەختە و شوێنی بینەران لە یەکترەوە نزیکن، بانیژەیەکی بچوك لەلای ڕاستی بینەرانەوە بۆ سیزەرەکان دروستکراوە، تا لەوێوە نەمایشەکان ببینن. هەموو کۆشکەکە و شانۆکەش لە ساڵەکانی سەدەی نۆزدەدا دروستکراون و بە بەراورد لەگەڵ زۆر شوێن و شتی تردا ئەم کۆشکە مۆدێرنە و هێندە کۆن نییە.

لە بازاڕە میللییە هەژارەکانەوە، بە ناوەڕاستی پەکین دا و لە شەقامە قەرەباڵخەکانەوە، خۆمان دەگەیەنینە وێستگەی شەمەندەفەر، دوای پشوویەك و کاتژمێر پێنجی ئێوارە بەرەو شاری سیان کە نزیکەی هەزار و سەد و شەست کیلۆمەتر لە پەکینەوە دوورە، دەکەینە ڕێ.

## لە شەمەندەفەرەکەدا

لە دەسپێکی گەشتەکەماندا، ناچاربووین نیو کاتژمێر لە هۆڵی چاوەڕوانی دانیشین. وێستگەی شەمەندەفەرەکە پڕە لە خەڵك، هەزارەها کەس دێن و دەچن، بە زەرفی گەورەوە، جانتای جۆراوجۆر، عەرەبانە، پاسکیل، منداڵ بە کۆڵەوە، سەرباز، پیر و گەنج... ئەمە دەریایەکە، شەپۆلێکە لە خەڵك و ئێمە هەروەك ئەوەی نەتوانین لەجێگای خۆمان بجوڵێین، خۆمان لە پاڵ دیوارێکدا پەنا داوە، لە یەك دوور ناکەوینەوە تا لەنێو ئەو هوروژمی خەڵکەدا لەیەك دانەبڕێین.

کاتی بەرێکەوتن دێت و لە دەرگایەکی تایبەتمەندەوە، بەر لە شالاوی خەڵکەکە دەچینە شەمەندەفەرەکەوە. لە واگۆنێکی تایبەت، نزیك لە یەکترەوە دادەنیشین و سیمای یەکتری لە نزیکەوە دەبینین، نان دەخۆین و بە هەر چوارلادا قسە دەکەین، شەراب دەخۆینەوە و جار بەجار قاقای پێکەنین لێرە و لەوێ بەرزدەبێتەوە. لەتاریکی نیوەشەودا،



شەمەندەفەرەکەمان موسافیرە خەواڵو و نووستووەکانی بەسەر ڕووبارە زەردەکە و بە ناو دڵی تاریکی شەودا دەپەڕێنێتەوە. ڕووبارە زەردەکە زەوییەکی بەپیتی بە چین بەخشیوە، ڕووبارێکی گەورە و دیارە و ناوەکەشی لەو پارچە گەورە گڵیانەوە، کە دەبێتە شێوەیەك لە خاك دروستبوون وەرگرتووە، لەکاتێکدا ڕووبارەکە ئەم خاکە لەگەڵ خۆی ڕادەماڵێت ڕەنگێکی زەرد دروست دەکات. ڕێگەپیشاندەرەکەمان دەڵێت "ئێستا بەسەر ڕووبارە زەردەکەدا دەپەڕینەوە" من ڕادەکەمە ڕاڕەوە باریکەکە، پەنجەرەی شەمەندەفەرەکە دەکەمەوە و دەڕوانمە دەرەوە، بەڵام لە تاریکساتانێك زیاتر هیچ نابینم و هەوایەکی فێنکیش لە ڕووبارەکەوە، وەك ئەوەی لەو تاریکییەدا و بە نهێنی شتێك بە گوێمدا بچرپێنێت، دێت و دەموچاوم ختوکە دەدات.




**3/1**

لە سیان

یەکەم هۆز و خێزانە چینییەکان لەم دەڤەرەدا ژیاون و لەکاتی حوکمڕانی بنەماڵەی خێزانی تانگ ـ**618 907** سیان گەورەترین شاری جیهان بووە. زیاتر لە هەزار ساڵیش ئەم شارە پایتەختی یازدە سیزەری ئەو بنەماڵە و خێزانە پادشاییانە بووە.

سیان ڕێگەی گواستنەوەی ئاوریشم بووە بەرەو دەرەوە، لەوێوە کاروانی حوشتر، ئاوریشم، داوودەرمان و چایان بارکردووە، ئەم شارە بۆ وڵاتی چین خاڵی پێگەیشتن و لێکترازان بووە بە دنیای دەرەوە.

دوای پشوویەك دەچینە شار و سەیری ئەو شورا بەردینە مەزنە دەکەین کە بە چواردەوری بەشی ناوەوەی شاردا درێژ دەبێتەوە، ئەم شورایە لە سەردەمی بنەماڵەی تانگ دا دروستکراوە و زیاتر بە مەبەستی سەربازی و بەرگریکردن بنیاتنراوە. دیوارە بەردینەکانی ئەم شورایە دوازدە مەتر بەرزە، لە سەریشەوە دوازدە بۆ چواردە مەتر پانە، بەڵام لە خوارەوە و لەسەر بناخەکانییەوە ، پازدە تا هەژدە مەتر پانە. ئەم شورایە چوار دەرگای سەرەکی هەیە، یەکێکیان لە

خۆرهەڵات، ڕۆژئاوا، باشوور و باکوورەوە.

شاری سیان دەکەوێتە دەوروبەری یان ناوچە نزیکەکانی دەریای زەرد و بەهۆی ئاو و بەروبوومی زەوییەکەیەوە دادەنرێت بە بێشکەی شارستانییەتی وڵاتی چین.
بەشە دێرینەکەی ئەم شارە بریتییە لە چەندین کۆڵان و شەقامی باریك و تەسك، ئەم کۆڵانانە هەموویان بە شێوەیەك لە شێوەکان پێکەوە بەستراونەتەوە و لەوسەری کۆڵانەکانەوە کە دێتە دەرەوە، لە گۆڕەپانێکەوە یەکسەر دەگەیتە بەردەم مزگەوتێکی گەورە. ئەم مزگەوتە لە سەردەمی دەسەڵاتی بنەماڵەی مینگ ـ و لە دەوروبەری ساڵی **742** دا دروستکراوە، لەو سەردەمەدا بازرگانی زۆر بەهێز بووە و چەندین بازرگانی گەورە لە ئێران، ئەو ناوچانەی کە ئەمڕۆ عێراق و ئەفغانستانە، بە شێوەیەکی هەمیشەیی لەم شارەدا ژیاون. ئێستاش نزیکەی شەش هەزار موسوڵمان لەم شارەدا دەژین.

یەکەم جارە مزگەوتێکی وا دەبینم، ئەرشیتیکتوری خانووبەرەکە تێکەڵەیەکە لە هونەری ئەندازەی دێرینی ئیسلامی و چینی، مزگەوتێکی بێ منارە و زیاتر لە پەرستگەیەکی بوودیی دەکات، نەك مزگەوتێکی ئاسایی موسڵمانان. باخچەیەکی گەورە پانتاییە فراوانەکەی بەردەم ژووری نوێژکردنەکەی داگیرکردووە، جگە لەو باخچەیە سێ باخچەی تر وەك کۆشکێکی سیزەرە چینییەکان مزگەوتەکەی ڕازاندۆتەوە.
مجەور و مەلاکانی مزگەوتەکە ڕێگە نادەن بە گەشتیاران کە بچنە ناو ژووری نوێژکردنەوە، گروپەکەمان بەنێو باخچەکاندا دەگەڕێن، من لە ئیمامی مزگەوتەکە دەچمە پێشەوە، سڵاوی لێدەکەم و تێیدەگەیەنم کە من موسڵمانم. پێڵاوەکانم دادەکەنم و لەگەڵیدا دەچمە ژوورەوە و بە چەشنی مزگەوتەکانی لای خۆمان تا چاوبڕکا فەرش ڕاخراوە.
شارەکە چڕە بە دانیشتوان، کە لە گۆڕەپانەکەی دەرەوەدا ڕادەوەستم. لەسەری خەڵك کە لە بزافتێکی خێرا و بەردەوامدان، هیچیتر نابینم، هاژەهاژی دەنگ جۆرە ئاوازێکی تایبەتمەند دروست دەکات و پاش قەیرێك هەست بە ماندوویتی دەکەم. هوروژمی خەڵك، دەنگی هەزارەها ئۆتۆمبێل، ماتۆڕ و عەرەبانە مرۆ هیلاك دەکات.
لە بەشە کۆنەکەی ئەم شارەدا، کە هێمنترە و زیاتر شوینەوارە دێرینەکانی پێوە دیارە، کاتژمێرێکی تاورئاسا بەرزبۆتەوە، ئەم تاوەرە بیست و سی مەتر درێژە و لە ساڵی **1384** دا دروستکراوە و لە ساڵی **1582** ەوە هێنراوەتە ئەم شوێنە و تا ئێستاش هەمان کاتژمێرە گەورەکەی سەردەمی مینگ ـ ی پێدا



هەڵواسراوە. کە لەم کاتژمێرە بەرزە دەڕوانم بیر لە زەمەن و چەمکی زەمەن دەکەمەوە. چینییە کۆنەکان چۆن مامەڵەیان لەگەڵ زەمەندا کردووە، تا بڵندگۆ و تاوەرێکی ئاوا بەرز و گەورەیان بۆ دروستکردووە، لەوانەیە ویستبێتیان لە هەموو شوێنێکی شارەکەوە بیبینن و زەنگی تێپەڕبوونی کاتیش هەموو سەری سەعاتێك وریای کردبنەوە.

**4/1**

قازە کێوییەکەی پەگۆد

لەم شارە مێژووییەدا شوێنەواری دێرین و پاشماوەی بەنرخ و هیماگەلی مرۆڤایەتی لە ئایینە جیاوازەکان، جوگرافیایەکی هەمەچەشن و ژیانێکی هاوبەشدا ڕەنگیداوەتەوە.

بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵاتندا سەردانی پەرستگەی قازە کێوییەکەی پەگۆد دەکەین. ئەم پەرستگەیە هێماگەلێکی شارەکەیە و تاکە شوێنێکی بودیستەکانە کە بە شێوەیەکی تەواوەتی و وەك خۆی ماوەتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی بنەماڵەی تانگ لەنێوان ساڵانی **618** ـ**907** دا. پەرستگەکەش بەپێی سەرچاوە بودییەکان لە ساڵی **652** دا بۆ مەبەستی هەڵگرتن و پاراستنی کتێبە پیرۆزەکان دروستکراوە.

شوان زانگ کە ڕەبەندێکی بوودییەکان بووە و لە سەدەی حەڤدەیەمدا و لە گەشتێکی بێ وێنەی میتۆلۆژیدا، یەکەم کتێبە پیرۆزەکانی بوودای لە هیندستانەوە هێناوەتەوە بۆ ئەم پەرستگەیە.

شار کزەیەکی ساردی هەیە و تەمێکی خەستی قورسیش خۆی کێشاوە بەسەر ڕێگاکەدا، لە دەروازەی پەرستگاکەوە دەچینە گۆڕەپانێکی گەورەوە، باخچەیەکی قەشەنگیش گۆڕەپانەکەی ڕازاندۆتەوە، هەر لەم پەرستگایەدا تاوەرێکی حەوت نهۆمی کۆن، کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی شەش سەدەکان بەرزبۆتەوە.

لە نهۆمی یەکەمدا ژمارەیەکی زۆر ڕەبەن خەریکی ڕیتواڵێکی ئایینین، لە نەماشێکی سەرنجراکێشدا نوێژێکی بەکۆمەڵ دەکەن، تەرتیلە، تەپڵی گەورە،



سەمایەکی هێمنی ئامێتە بە ڕەهەندێکی ئایینی دەکەن و ئێمەش بە چواردەوریاندا لە دەرەوەی پەرستگەکەی خۆیانەوە ڕاوەستاوین و تەماشایان دەکەین. ژوورەکە هەموو دیوارەکانی بە دیوی دەرەوەدا بە شێوەی دەرگای گەورە کراونەتەوە و لە هەموو لایەکەوە والآیە.
لەم پەرستگەیەوە دەچین بۆ مۆزەخانەی مێژوویی کە دادەنرێت بە یەکێك لە گەورەترین مۆزەخانەکانی چین و زوربەی پاشماوە دێرینەکان و بە شێوەیەکی مێژوویی، لە سەردەمی بەردینەوە بەنێو هەموو مێژووی وڵاتی چین دا تا دەگاتە دوا بنەماڵەی سیزەرەکان، لە پارچەی هونەری، دەستنووسی کۆن، جلوبەرگی پادشاکان، جۆرەکانی چەك و چۆنییەتی بەکارهێنانی لە مێژوودا، قاپ و قاچاخ، بە شێوەیەکی گشتی هەموو شتێك کە لەو کۆمەڵگە کۆنانەدا بەکارهێنراون، لەخۆدەگرێت. هەروەها ئاڵوگۆڕی بازرگانی و ڕێگەی ئاوریشم لە مێژوودا، بەشێکی گرنگی مۆزەخانەکەیە.
لەم مۆزەخانەیەدا دووپاتی مەزنی و دێرینیی شاری سیان دەکرێتەوە، بەتایبەتی لە سەردەمی بنەماڵەی هان و تانگ دا.

**5/1**

سوپای قوڕینی چین

گۆڕی زیاد لە حەفتا و دوو سیزەر و پادشا لە شاری سیان و دەوروبەرەکەیەتی، گرنگترین گۆڕیش دوا ئارامگەی کین ـ سیزەری یەکەمە.

هەر لە ساڵەکانی **247** دوای لەدایکبوونی مەسیحەوە، زیاتر لە حەوت سەد هەزار کەس کاریان لە گۆڕی کین ـ دا کردووە، کە ئەو دەمە شازادە و تەمەنی تەنها سیازدە ساڵ بوو. دوای سی و شەش ساڵ کارکردن ئەم گۆڕستانە بۆ سیزەری یەکەم تەواو دەبێت. بەم سی و شەش ساڵە سوپای قوڕینی چین دروست دەکەن تا پارێزگاری لە ئارامگا و ڕۆحی سیزەر بکات.
ئەم لەشکرە قوڕینە پەیکەری شەش هەزار سەربازە، بە هەموو جلوبەرگ و شیر و تیروکەوانەوە، ئەسپ و عەرەبانەی جەنگی و هەمووشیان لە ئامادەباشییەکی بەردەوامدان و بە بارستەی باڵای مرۆڤی ئاسایی دروستکراون. مرۆ هەست بە مەزنی و ترسێکی گەورە دەکات، چی وا لە پادشایەك دەکات بەم شێوەیە بیربکاتەوە، دەزانێت دەمرێت بەڵام سوپایەك لە قوڕ دروست دەکات تا لەژێرزەمیندا پاسەوانی لێ بکەن و دەسەڵاتی فەرمانڕەواییەکەشی، لەوە دنیاش هەر بەردەوام بێت. مەرگ ئامادەییەکی بەردەوامی هەبووە و لەوانەیە وەك پاڵەوانەکانی ئینگمار بێرگمان گەمەی شەترەنجیان لەگەڵ مەرگدا کردبێت. ئەم لەشکرە قوڕینە لە ساڵی **1974** دا



لەلایەن چەند جوتیارێکەوە دۆزراوەتەوە و دوای هەڵکەندن و پاککردنەوەی لە شوێنەکەی خۆیدا نەگوێزراوەتەوە، بەڵکو لەبری ئەوە خانووبەرەیەکی گەورە، کە ئەمڕۆ مۆزەخانەیە، بەچوار دەوری شوێنەکەدا دروست دەکەن. ئەم لەشکرە دێرینە ئێستا لەم مۆزەخانەیەدا لە یازدە ڕاڕەوی درێژ و گەورەدا، بەتەنیشت یەکەوە ڕاوەستاون. سەربازەکان بە شیر و ڕمەوە، بەڕیزی چوار چوار وەستاون، هەندێکیان ئەسپ و عەرەبانەکان ڕادەکێشن، قەوارەی سەربازەکان نزیکەی **180** تا **190** سێنتێمەتر درێژن، دەموچاوی هەر سەربازێکیش سیمای تایبەتی خۆی هەیە و لە هیچ دەموچاوێکی تر ناچێت. چینییەکان و لەو سەردەمەدا و بۆ پارێزگاریکردنی فیگور و لەشکرەکە، لەژێر زەوییەوە ساپیتەیەکی لە تەختە، دارەڕێژەیان بۆ دروستکردوون. ئەم مۆزەخانەیە کە **230** مەتر دووجا گەورەیە و **62** مەتر دووجا پانە، لەساڵی **1979** دا کراوەتەوە. گۆڕی دووەمیان کە بەشێکی تری مۆزەخانەکەیە لە ساڵی **1994** دا کراوەتەوە، لەم بەشەشدا زیاتر لە هەزار سەرباز و نەوەد عەرەبانەی جەنگ لەخۆدەگرێت. بەڵام بەشی سێیەمیان لە ساڵی **1998** دا کردۆتەوە.

بە بەرزاییەکەوە بەدیار ئەم لەشکرە قوڕینەوە وەستاوم، لە ساتگەلێکی کتوپڕدا وا هەست دەکەم دەبزوێن و لە مارشێکی سەربازیدا بەرەو ڕووم دێن، بۆنی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەکانی سەردەمی کۆنیان لێدێت. کات تێدەپەڕێت و ناتوانم بچمە دەرەوە، کات وەستاوە و لە زەمەنێکی دێریندا گیرم خواردووە، دەدوێم بەڵام ئەو سەربازانە، وەك سەربازە بێ پەروا و بێ بەزەییەکانی ئەمڕۆمان گوێیان لەهیچ نییە و مەرگ و زەمەن لەگەڵ نەمریی و ئەبەدییەتدا ڕووبەڕوو وەستاون.



**6/1**

گەڕانەوە بۆ پەکین

پەرستگەی لامە

بەیانی زوو بە فڕۆکە دەگەڕێینەوە بۆ پەکین و ڕاستەوخۆ دەچین بۆ پەرستگای لامە، ئەمەش جۆرێکە لە پەرستگای بوودییەکانی تێبێت. پەرستگەکە لە

خانووبەرەیەکی گەورە و مەزندایە و لە سەرەتادا یەکێك بووە لە کۆشکی سیزەرەکانی چین. ئەم پەرستگەیە لە سەرەتادا خانووبەرە و جێگای حەوانەوەی پیان زێنیس ـ ی شازادە بووە. کە ئەم شازادەیە دەبێتە سیزەری وڵات و لە ساڵی **1744** دا، دوای خۆی کورەکەی کیان لۆنگ ی سیزەر ئەم خانووە دەکات بە شوێنی ڕەبەندە بوودییەکان. ئێستا ئەم پەرستگەیە مۆزەخانەیەکی گرنگیش لەخۆدەگرێت.

لە دەروازەی چەندین ژوورەوە یەك لەدوای یەك دەڕۆین، لەهەمانکاتدا لەهەموو لایەکەوە چەندین ژووری تر هەن، لەم ژوورانەدا هەزارەها هونەری بوودایی لە پەیکەر، قاپوقاچاخ و جۆرەها شتی تری تێدا پارێزراوە، بەردەرگای پەرستگەکەش لە ڕوکاری دەرەوە بە چەندین پەیکەری شێر، کە لە بەرد دروستکراون ڕازێنراونەتەوە.

بە ژوورەکاندا دەڕۆین تا لە بەرئەنجامدا و لەوسەری پەرستگەکەدا گەورەترین پەیکەری بودا دەبینین. پەیکەرەکە لە دار دروستکراوە و بیست و شەس مەتر بەرزە و لەهەر چوارلاوە بە هەشت بانیژە دەورە دراوە، لەهەر بانیژەیەکدا بەشێکی پەیکەرەکە بە وردەکارییەکانییەوە دەبینین.

تیشکی خۆر لە درزی دیوار و پەنجەرەی بچوکی هەمەچەشنەوە هاتۆتە ژوورەوە و وەك فانۆسێکی ئەفسوناوی، بە ئاراستەی جۆراوجۆر بەسەر دیوارەکانەوەیە. ساپیتەی پەرستگەکە زەردە، دیوارەکانی سوورن و پەیکەرەکانیش بە ڕەنگە گەرم و زەقەکانەوە، لەنێوان ڕەنگی زەرد و سوردا بووەتە دیمەنێکی سینەمایی. ئەم پەرستگەیە لەلایەن کۆمەڵێك ڕەبەندی چینی، مەنگۆلیی و تیبێتییەوە بەڕێوەدەبرێت.

**7/1**

دوای سەردانی شوینەوار و مۆزەخانە و شوێنی مێژوویی و هۆڵی هونەری، دەمانەوێت ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئاسایی، گەر بە شێوەیەکی سەرپێیش بووە بەسەر بکەینەوە، ئاوڕێك لەو ژیانە بدەینەوە و وێنەیەکی گوزەرانی خەڵکی ببینین.

لەسەر شەقام و شوێنە گشتییەکان دوور دەکەوینەوە و دەچینە ناوچەیەکی خانووبەرە و ناو ژیانی ڕۆژانەی خەڵکییەوە. گەڕەکەکە مۆرکێکی کلاسیکی خانووبەرەی چینی لەخۆدەگرێت و لە ڕێگای چاوساخەکەمانەوە دەبینە میوانی خێزانێك. ئەم خانەوادەیە هەرچەندە سەر بە چینێکی مامناوەندین، یان دەتوانین بڵێین بەرزی کۆمەڵن و پیاوەکە لەوەوبەر وەك وێنەگرێکی دانپێدانراو کاریکردووە، تەنها دوو ژوور و مەتبەخێکی بچوك و سەرەتاییان هەیە. پیاوەکە ڕووخۆش و دەم بە پێکەنینە، ژنەکەی بە زمانی ئاماژە و جەستە



مەتبەخە بچووکەکەی پیشان دەدات و دەیەوێت پێمان بڵێت کە هیچ جۆرە پێداویستییەکی ئاسایی و ساکاری تێدا نییە.
دوای ئەوە دەچین بۆ باخچەیەکی ساوایان، کۆمەڵی منداڵی رۆح سوك خەریکی گەمەن، پێکەوە قسە دەکەن و جیهانێکی تایبەتییان دروستکردووە و بەهیچ شێوەیەك هەڵسوکەوتی دنیای گەورە، بۆ نموونە هاتنەژوورەوەی ئێمە و ئامادەبوونی مامۆستاکانیان جێگای سەرنج نین و بە وردی و قووڵی لەگەڵ جیهانەکەی خۆیان تەبان.

**8/1**

**گەڕانەوە**

زەنگی ئاگادارکردنەوەی کاتژمێرەکەم لە بەرەبەیانییەکی تاریکدا، بەئاگام دێنێتەوە، ژوورەکە تاریکە و چاوەکانم بە تەواوەتی نەکراونەتەوە و خەواڵوم و رێگای دەست بەئاو گەیاندنم بۆ نادۆزرێتەوە. دەستوبرد دەکەم، خۆم دەگۆڕم و لە خوارەوە خەریکی خواردنی بەرچایی دەبم. کاتژمێر شەش لە میوانخانەکەمانەوە بەرەو فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی چین بەڕێدەکەوین.
هەمووومان خەواڵووین، کەس تاقەتی نییە لەگەڵ کەس قسە بکات، هەندێك سەری ناوە بە پەنجەرەی پاسەکەوە و نوستووە، هەندێکی تر بە چاوێکی خەواڵووەوە دەڕوانێتە سەرشەقام و ئەو شوینانەی کە پیایاندا تێدەپەڕین، وەك ئەوەی دوا ماڵئاوایی بکەین و وێنەکان لە هەست و هۆشماندا تۆمار بکەین.
لە پەنجەرەکەوە سەیری ئەو خەڵکە دەکەم کە گەمەی جەستە تای شی دەکەن و هێدی هێدی لەنێو تەمە سپییە چڕەکە و دوورکەوتنەوەی مەوداکانی نێوانماندا دیارنامێنن.
کاتژمێر نۆی بەیانی بەکاتی چین لەسەر جێگاکانمان لەنێو فڕۆکەکەدا دانیشتووین، کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆ لە فڕۆکەخانەی ئێرلەندا لە ستۆکهۆڵم دەنیشینەوە. سەیری کاتژمێرەکەم دەکەم، بەکاتی چین دەی شەوە و یەکەم شت کە دەیکەم کاتژمێرەکەم لەگەڵ کاتی سوێددا رێك دەخەم و لە فڕۆکەکە دێمە خوارەوە. دنیا بەرەو



تاریکی ڕۆیشتووە، سارده و بەفرێکی زۆریش باریوە.

پەراوێزەکان

1. ئەم سەفەرەم لە 29 ی دوازدەی ساڵی 1998 دا کردووە و 8 ی مانگی یەکی 1999 گەڕاومەتەوە. ڕۆژانی سەفەرەکەم بەشێوەیەکی ورد وەك یاداشتنامەیەك و ڕۆژانە تۆمارکردووە، ئەمەی بەردەستتان بەشێکە لەو بیرەوەرییانە.

2. لە ساڵەکانی 200 ی دوای لەدایکبوونی مەسیحەوە، گروپێکی تایبەتمەند کە کاریان ئەوە بووە بەرنامە کولتوورییەکانی کۆشکی پادشا و سیزەرەکان ئامادە بکەن، لەم پرۆگرامانەوە شانۆی چینی لەدایکبووە. بەڵام لە ساڵەکانی 1100 دا و لە سەردەمی بنەماڵەی هۆنگ دا، فۆرم و شێوازی خۆی وەرگرتووە و لە سەردەمی خێزانی پیان ـ مەنگۆلیدا 1271ـ 1368 دەگاتە ئاستێکی بەرز و گەورە. هەر لەم سەردەمەدا گروپێکی شانۆنامەنووس دەکەونە ڕێکخستن و ئامادەکردنی نەمایشەکان، بەپێی سەرچاوە کۆنەکانیش لەو سەردەمەدا زیاتر لە سەد و پەنجا شانۆنامە هەبوون، لەناو ئەو شانۆنامانەشدا، تێکستێك بەناونیشانی بازنەی تەباشیر هەبووە. ئەم شانۆنامەیە لە ساڵەکانی 1700 ـەکاندا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانە ئەوروپییەکان و برێشت سوودی لێوەردەگرێت بۆ نووسینی شانۆنامە بەناوبانگەکەی بازنەی تەباشیری قەوقاز. دواتر شانۆ و ئۆپێرا بە شێوەیەکی بەربڵاو بەنێو هەموو شار، هەرێم و ناوچەکانی چین دا بڵاودەبێتەوە، تا دەگاتە ئەو ئاستەی کە پێشبڕکێی ئەم ئۆپێرایانە لەنێوان شار و ناوچەکاندا دروست دەبێت. دوو جۆریش ئۆپێرای پەکین هەیە، یەکێکیان سەبارەت بە ژیان و خەڵکی ئاساییە و ئەویتریشیان هەمیشە سەربازییە و باسی ژیانی جەنگاوەرەکان، لەشکرکێشی، جەنگ و پێکدادان و شەڕی نێوان هەرێم و داگیرکەرەکان دەکات.

3. (لی) Li پێوانەیەکی چینییە و یەك لی نزیکەی پێنچ سەد مەترە.

4. سیکسی دوا بێوەژنی سیزەرەکان و لە سەرەتای هەزار و نۆ سەدەکاندا فەرمانیداوە کە ئەم شوێنە بکرێتە باخچەی ئاژەڵان، لە ساڵی 1950 یشەوە بۆ خەڵکی کراوەتەوە و بووەتە شوێنێکی گشتی و ئەم باخچەی ئاژەڵانەی ئێستا.





# پەرەسێلکەی هاوڕێم

**سەردار عەزیز**

هێشتا تەمەنت چەند ڕۆژێك بوو، پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانە هات بۆ سەردانت. ئەو ڕۆژانە ماڵمان لە سەر گردەکەبوو، لە خانوە کۆنەکەی سەردەمی ئینگلیز لە شاری کۆرك. تۆ لە ناو باسکەیەکدا بووی کە لە پوش دروستکرابوو کە پێی دەڵێن باسکەی موسا. حیکایەتەکە وەهایە لە سەردەمی فیرعەوندا بڕیار دراوبوو هەر جولەکەیەك کوڕی بێت دەبێت فڕێی داتە ناو ڕووباری نیلەوە، تەنها دەبێت مێینەکان بمێننەوە. بەڵام کە موسا لە دایك بوو هێندە جوان بوو، دایکی بۆ سێ مانگ شاردیەوە پاشان بردیە کەنار نیل لە شەغەڵێکدا داینا، کاتێك یەکێك لە کچەکانی فیرعەون بەوێدا تێپەڕی گوێی لە گریان و نوزەی مناڵێك بوو، یەکێك لە کارەکەرەکانی نارد هەتا بیهێنێت. مناڵەکە لە ناو باسکەیەکدا بوو لە پوش، هێندە جوان بوو کچی فیرعەون بریاری دا کە بەخێوی بکات. کاری بەخێوکردنەکەی سپارد بە یەکێك لە کارەکەرەکانی پاشا، کە موسا گەورەبوو کچەکەی فیرعەون بە کوڕی خۆی داینا. موسا گەورە دەبێت و جولەکە لە دەریا دەپەڕێنێتەوە و دەچن بۆ سەر زەمینی تر.

دەبینی هەر لە سەرەتاوە لە نکوڵی و نهێنی و هەڵهاتن ئالاوی. لە سەفەر جێهێشتن و ئێکسایل.

پیاوە کەڵەلگەتەکە خاوەن دیدێکی ڕۆمانسی بوو. لە زانکۆ پرۆفیسۆری شیعر بوو، لە گەڵ خۆیدا بە دیاری پەیکەرێکی بچکۆلەی پەرەسێلکەی هێنابوو. پەرەسیلکە، پیاوەکە وتی، سرووشتی ئەم منالّەیە. پەرەسێلکە کەم دێتە سەر زەوی، زۆربەی کات لە ئاسمان دەژی. بەڵام مرۆڤ هەمیشە دڵخۆشە بە هاتنی پەڕەسیلکە. لە نێو زۆر گەلی دونیادا پەرسیێکە سیمبولە، نیشانەیە، پیرۆزە، تایبەتە. یونانەکان گۆڕانیان بەباڵای هاتنی پەرەسێلکەدا دەگوت کاتێك کە دەهاتن. لە گەڵ هاتنی پەرەسێلکەدا منالان دەچوون بۆ ماڵان و داوای شاباشیان دەکرد. لە دورگەی رۆدس خەڵکی گۆرانیەك دەچرن کە دەڵێت، پەرسێلکە هات و وەرزی خۆشی و ساڵی خۆشتری هێنا. دەرکەوتنی پەرەسیلکە سەرەتایە بۆ گەرمبوونەوە و بوژانەوە. کەواتە پەرەسێلکە لە نەورۆزدا دێت. بەڵام ئەرستۆ ئاگادارمان دەکاتەوە کە بە تەنها یەك پەرەسیلکە بەهار نایەت. یونانەکان بڕوایان وابوو کە پەرسیلکە لەگەڵ بادادێت بۆیە بایەك هەیە لە یونان ناوی شێلدۆنیاسە، کە یانی بای پەرەسێلکە. بەڵام لای هۆمەر و لای شکسپیریش لە ماکبێثدا پەرسێلکە نیشانەیە، نیشانەی ڕووداوی ڕووداوێك.

لە کۆتایی وێرانە خاکدا تی ئێس ئیلیوت بە زمانی لاتینی دەنوسێت: کەی بەهاری من دێت؟ کەی دەبمە پەرەسێلکە، لەوە بکەوم کە بێدەنگ بم؟ پاشان لە لاوەکی عەشقی ئەلفریدا تێنیسۆنەوە بانگهێشتی پەرەسیلکە دەکات؛ ئەی پەرەسیلکە، ئەی پەرەسێلکە، بفرە بفرە بەرەو باشور. بفرە بۆ لای یار، بەسەر سەربانەکەیانەوە بنیشەوە. هەموو ئەوەی بۆ بگێڕەوە کە پێم وتی.



پەرەسێلکە بوونی تۆ نیشانەی ئاسمانگەڕیت بوو. بێ نیشتمانی، یان فرە نیشتمانی. ئاسمان جێگایەکی خۆشترە لە زەوی چونکە سنوور و نیشتمان و وڵات و خاك و ڕەگ و ڕیشە و یادەوەری و پیرۆزی تیا نییە. دەکرێت تۆ منالّی ئاسمان بیت و

تەنها بۆ زاوزێ هاتبێتە سەر زەوی. بۆیە لە سەر زەوی هەر لە سەرەتاوە گەریدەی. گەریدەی نێوان زمانەکان، کەلتورەکان، وڵاتەکان، ئاگاییەکان، گۆرانیەکان و عیشقەکان. پەرەسێلکەکەمان بە سەر سەرتەوە لە نزیك ئاگردانەکە هەڵواسی. ئێستا تۆ ئەم رۆژانە دەبێت بە شەش ساڵ. لەم شەش ساڵەدا زیاتر لە دە وڵات و چەندین شار گەڕاویت. لە شەش ساڵیدا سەردەمێکی نوێ لە تەمەنتدا دەست پێدەکات. سەردەمی قوتابخانە. قوتابخانە جێگای وەرگرتنی زانیارییە بۆ ئەوەی ببێتە کەسێکی چالاك لە هەناوی کۆمەڵگادا. قوتابخانە دژە سروشتی مرۆڤە، جێگای خەساندنە. ئەم ساڵانە زوو گوزەشتن. وەك ئێستا لە بیرمە، لە نیوە شەوێکی هاویندا لە نەخۆشخانەی کۆرك گەشتی. ڕەش تاڵەیەکی خوێن گەرم بووی، گەرمیانی واتەنی. لەوەتەی زۆر جێگا پێکەوە گەڕاین. بە زۆر ئاسماندا فرین، لە شەمەندەفەردا بۆ زۆر دارستان و کێڵگەی پڕ لە گوڵدا ڕۆشتین. زۆر سەرکێشیمان کرد. لە هامبۆرگ، لە باکوری ئەڵمانیا هێندە پەنجەت بە زەنگی وەستانی پاسەکەدا نا هەتا شۆفێرە ئەڵمانیەکە مانی گرت لە ڕۆشتن. هەموو سەرنشینەکان واقیان وڕما. خەڵکی ئەڵمانی بە سرووشت مان ناگرن، ئەوان لە هەموان زیاتر ملکەچی یاسان. لە بیرتە لە بەرلین لە سەر شۆستە، دژ بە هەموو یاسایەك، یاری دوو گۆڵیمان کرد، بە باخە ناکۆتاکاندا تا پێیەکانمان توانی ڕۆشتین. لە پیتزاخانە ئیتالیەکە وەهایانزانی من باوکێکی تاقانەم. لەو باوکانەی کە لە هاوسەرەکیان جیابونەتەوە و جارجارێك مناڵەکەیان دەبینن، لە گەڵ خۆیاندا دەیبەن بۆ دەرەوە. دۆخی خێزانی لەم کیشوەرە ساردەدا دڵتەنگە. هەتابێت مرۆڤەکان کەمتر پێکەوە هەڵئەکەن.

لە وارشۆ کاتی زۆرمان پێکەوە بەسەربرد. لە سەر شانم بووی هەتا بە دزیەوە گێلاسی دارەکان دابگریت. وارشۆ لە هاویندا وەك شارێکی فراوان دەردەکەوێت. شۆستەکان لە خشتی سوربوون. کۆگاکان لە شێوازی سەدە ناوەندیەکان. زیاتر ئاماژەت دەبینی لە بڕی پیت. ساتێکی زۆرمان لە ئەستەنبول بە خەساردا لە تەماشاکردنی پشیلەدا. هیچ شارێکی ترم نەدیوە هێندەی ئەستەنبول پڕبێت لە پشیلە. پشیلەکان لەوێ بە پێچەوانەی پشیلەکانی کوردستان پاك و قەڵە و خۆش بەختن. مایەی ئازارە کە پشیلەبیت لە نێو کورددا. لە



ئەنقەرە تێرت لە ئایسکریم نەئەخوارد. ئەنقەرە شارێکە پڕ ئاماژەی تورکیای نوێ. ئەستەمە لەو شارەدا جوانی ببینیتەوە. هەموو شتێك هێندە مۆدرێن و رەقە، رۆح هەست دەکات کە پێویستە زوو هەڵبێت. ئەنقەرە چیرۆکی جودا دەگێڕێتەوە لە جێگاکانی تر. چیرۆکی ئەنقەرە چیرۆکی خەونی لە سەرەتاوە دەست پێکردنە. لە گوندە دیوار هەڵوەریوەکانی بناری ئەلپ لە ئیتاڵیا پیتزای زەیتونمان پێکەوە خوارد. ئیتالیا سەرزەمینێکی ئاشنا و نائاشنایە بە تۆ. کەس و کارت لە باکوری ئەو وڵاتە وەك چۆن کەس و کارە کوردەکانت حەز ناکەن سەر بە وڵاتی دەستکردیان بن، چیرۆکی ئەوانیش وەهایە. لە شاری ساڵۆنیکی لە یونان نەتدەویست بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە. پێکەوە لە یۆنانەوە بۆ کوردستان بە پاس سەفەرمان کرد. کرمانجەکان کوردەکان کە لە ئەستەنبولەوە بۆ ماڵ دەرۆشتنەوە، هەموو بوونە دۆستت. لە بیرت دێت لە برۆکسل نەخۆش کەوتی ناچاربووین لە بەر جەنجاڵی و ژاوەژاو بڕۆین بۆ شارێکی تر کە پێیان دەوت گێنت.

من و تۆ سەفەر و عەشق کۆمان ئەکاتەوە. سەفەر و عەشق وەك یەکن، وەك سانتایانا دەڵێت، هەردوکیان سەرەتایان هەیە بەڵام ناکۆتان. بەڵام سەرباری هەموو ئەم پێکەوەبوونە من و تۆ لە یەك ناچین. تۆ مناڵی فەنتازیایەکی تری. بەیانیان زوو دەربارەی ماسی ناو تاریکی دەریا زانیاریم پێ دەڵێیت، شارەکان وەك یاری وەهان لە لات. من خەریك بوو دووجار باڵق بم کاتێ کە سواری فرۆکە بووم. تۆ گەورەدەبیت و من پیر، هەتا بێت زیاتر موجادەلە ئەکەین. دەبینم دونیاکەمان لەیەکتر دەترازێت. من ئازار دەچێژم کە نە وڵاتم هەیە نە نیشتمان، تۆ بەلاتەوە ئاساییە. تۆ دەڵێی لە ئایرلەندا لە دایك بووم، دایکم ئیتاڵیە، باوکم خەڵکی کوردستانە لە زۆر جێگا ژیاوم، نازانم خەڵکی کوێم. فەنتازیای منیش پەیوەستە بە سەر زەمینێکی پەرتبوو. بەڵام پێکەوە بەردەوام دەبین لە عەشق، بەردەوام دەبین لە سەفەر.

